تەرجەمەی ئەم کتێبە پێشکەشە :

بە گیانی عاشقانەی "نزار قەببانی" خۆی..

وەرگێڕ

## لەبری پێشەکی، چەند پەیڤێکی وەرگێڕ:

زۆربەمان، کەم و زۆر، نزار قەببانیی شاعیر بەهۆی خوێندنەوەی شیعرەکانییەوە دەناسین. کە ناوی ئەم شاعیرە بە یادەوەریی هەر خوێنەرێك لە خوێنەرانی شیعرەکانیدا تێدەپەڕێت، بێ زۆر لەخۆکردن؛ بابەتەکانی عیشقی ژن و، خەونە زیندانیکراوەکانی ژن و، مەملەکەتی پڕ لە گاردو پاسەوان و جبەخانەی پیاوان و، قفڵکردنی ئازادیی ژنانی دێتە بەر زەین..

کێ هەیە هەست بە گەرمیی ئەو خوێنە رژاوەی جەستەی ژن نەکات کە پەیڤە شیعرییەکانی نزار دەبنە پلۆسك بۆی..؟

کێ هەیە لە پەنجەرەی شیعری نزارەوە گوێی لە زریکەی نیوەشەوانی ئەو کچانە نەبێت کە جەستەیان شین و مۆرو داخ دەکرێت؟

بەکورتی؛ شیعری نزار قەببانی، تەنانەت پەخشان و شێوازەکانی تری نووسینیشی؛ یانی دەستبردن بۆ ئەو شتە حەرامکراوانەی کە لە کۆمەڵگەی داخراوی پڕ لە قەیرانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و فکرییدا، باسکردنیان بە ئاشکرا، نەفرەتی دەسەڵاتەکانی بەرامبەر قسەکەر لە دوایەو هەر لە دەسەڵاتی کلتووری پیاوسالارییەوە تا دەگاتە دەسەڵاتی ئەو دامو دەزگایانەی کە پێکهاتەی کۆمەڵ لەسەر هەموو ئاستەکان پێك دەهێنن.

ئەو تێزو بۆچوونانەی نزاری شاعیر لێرەدا بە راشکاوی دەیانخاتە روو، ئەگەرچی زیاتر پەیوەندییان بە ئەزموونی خۆیەوە لە چوارچێوەی کۆمەڵگەی عەرەبیدا هەیە، ئەو کۆمەڵگەیەی کە لە پێکهاتەیدا هەمیشە گوتاری خێڵ و پاوانخوازیی و بیرکردنەوەی نێرینە زاڵ و باوە لە رامکردن و جڵەوکردنی سەرجەم مەسەلەکانی ژیان و ئازادیی مرۆڤداو بەتایبەتیش ژن، یاخود ئافرەت.. بەڵام تەرجەمەکردنیم بە کارێکی پێویست زانی، چونکە پێکهاتەی کۆمەڵگەی کوردیش- بەجیاوازیی زمان و خەسڵەت و مێژوویەوە- وەك کۆمەڵگەیەکی رۆژهەڵاتیی، بەدەر نییە لە هەمان ئەو مەرجەعیەتەی کە گوتاری خێڵ و سیستمی دامودەزگا کۆمەڵایەتییەکان دەچنە ژێر رکێفیەوە.. بگرە لەوەش زیاترو بەحوکمی هەژموونی هەمان ئەو کلتوورەی کە نزار باسی دەکات، بەسەر کۆمەڵگەی کوردیدا، گەلێك لە تێزو بۆچوونەکانی نزار سەبارەت بە رەتاندن و میحنەتباری ژن، نزیکن لە خۆشمانەوە..

دەبێ ئاماژەش بۆ ئەوە بکەم کە بەپێی ئازادیی بیروڕا، مەرج نییە من لەگەڵ سەرجەم وردو درشتی راو بۆچوونەکانی نزاردا کۆك بم، بەڵکو وێڕای ئەوەی لە زۆربەیاندا کۆك و تەبام لەگەڵیدا، بەڵام بەرامبەر هەندێکیان سەرنجی خۆم هەیەو، ئەو کۆك نەبوونەش رێگر نەبووە لە بەردەم تەرجەمەو بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبەدا، چونکە ئێمە هەمیشە پێویستمان بە دیالۆگ و جیاگەراییو فرەڕایی هەیە..

ئەوەی سەرنجی راکێشاوم، نزار قەببانی زۆر راشکاوانە رایەکانی خۆی وتوەو بێ سڵەمینەوە لە هەر جۆرە سانسۆرێك قسەکانی خۆی کردووە تەنانەت ئەگەر وەك ئینتیمای نەتەوایەتی وەك شاعیرێکی عەرەبیش، لەسەری کەوتبێت. بەر لە خوێندنەوەی کتێبەکەش پێم باشە سەرنجی خوێندەوارانی بەڕێزم بۆ ئەم چەند خاڵە رابکێشم

١-ئەوەندەی چوارچێوەی فکری و تێڕوانینی واقیعیانەی نزار رێگەیان دابێت و بێئەوەی قسەکانی ئەو بشێوێنم، هەوڵم داوە ئەم تەرجەمەیە، تەرجەمەیەکی حەرفیی نەبێت، سەرەڕاش هەردوو وشەی (ژن-ئافرەت)م بەپێی پێویست بەکارهێناوە

٢-نزار لە کتێبەکەیدا، هیچ ئاماژەیەکی بۆ ناوی ئەو کەناڵانەی میدیا نەکردووە کە ئەم قسەو باسانەیان لەگەڵدا وروژاندووە. جگە لەوەش ریزبەندیی و ژمارەدانان بۆ هەر پرسیارو وەڵامێك، خۆی چۆن داینـاون، وەك خۆیانم گواستۆتەوە

٣-کتێبەکە، دوو بەشە؛ بەشێکیان پرسیارو وەڵامەو، بەشەکەی تریشیان هەڤپەیڤینێکە لەنێوان نزارو محی الدین صبحی ی رەخنەگردا

دواجار، نزار قەببانی، سەرەڕای ئەو خەمە جوانانەی لێرەدا هەڵی رشتوون.. شاعیرێکی بەختەوەر بوو. چونکە هیچ نەبێت گوێ ی لێدەگیراو، لەهەر شوێنێك بیویستایە ئازادانە قسەی خۆی دەکردو، ئازادانەش سەفەری بەناو شیعرو وشەو نیشتماندا دەکرد..

هیوادارم ئەم تەرجەمەیە سوودو چێژی خۆی هەبێت..

جەمال غەمبار

کۆتاییەکانی دێسەمبەری/ ٢٠٠٠

دیمەشق/ سوریا

## ئەم کتێبە:

دوای چل ساڵ گەڕان بە هەرێمەکانی شیعرو ژندا، هەست دەکەم وێنەی من لای خەڵکی، هێشتاکە وێنەیەکی ساف و روون نییەو، شێواوەو رەنگەکانی بەیەکدا چوون..

بۆیە هەندێ کەس، روخسارم لەلایەنە رۆشنەکەیەوە دەبینن و پێی ئاسوودە دەبن و، هەندێکی تریش لایەنە تاریکەکەی روخسارم چاو دەکەن و، سەرئەنجام سڵی لێدەکەنەوە.

سەبارەت بە بیرو بۆچوونەکانیشم؛ ئەوا لە پرۆژەی ئەو بڕیارانە دەچن کە دەخرێنە بەردەم ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتییو، ئەگەرچی زۆر جاران دەنگ و رای هەژارو چەوساوەو قوربانییانی زەبرو زەنگ بە ژن و پیاوەوەو، هەروەها دەنگی ژنانی زیندە بەچاڵکراوی دنیای سێیان

بەدەست هیناوە.. کەچی ئەو زۆرەها جارە، سەرجەمی ئەو پرۆژانە بوونەتە قوربانیی ڤیتۆی ئەمریکی.

ئەز، سەرەرای ئەوەی بەوە وەسف دەکریم، کە شاعیریکم لە کەنداوەوە بۆ ئۆقیانووس (من المحيط الى الخليج) ناسراو و پر بەرهەمم.. هاوزەمان، ئەو شاعیرەشم کە لە کەنداوەوە بۆ ئۆقیانووس، بەزرترین کیوی خەمم بە کۆلەوەیە..

هەست دەکەم هیشتاکە کەسانیك هەن بەهەلە دەمخویننەوە.. یان کەسانیك بەهەلە لیم تیدەگەن.. یاخود هەن بەهەلە سەرم دەبرن.. من ئەوە دەزانم کە هەلبژاردنی "ژن" وەك بابەتیکی سەرەکیی نووسین، هەلبژاردنیکی قورسەو، ئاخاوتن لە بارەیەوە ئاخاوتنە لە بارەی حەرامکراوەکانەوەو، ئەو کەسەشی دەستی ژنیك دەگریت وەك ئەوە وایە پشکۆیەکی داگیرساوی گرتبیتە دەست.. ئەوەش دەزانم کە تیوەگلان لە پەیوەندییەك لەگەل ژنیکی جواندا لەم نیشتمانەی مندا وەك تیوەگلان وایە لە تاوانی قاچاخچیتی، یاخود تاوانی هەلکوتانە سەر بانکیك بەمەبەستی تالانکردنی..!

کەواتە، هەموو شاعیران هەمان موعاناتیان هەبیت کە من هەمە.. یان (بەتەنێ من ئەو عاشقەم، بۆ ئەوەی هەرچی سزاکانی ئەوین هەیە، لەکۆلی ئەز بنریت؟..).

بیگومان، ئەز ناخوازم کە وینەکەم، بە چەشنی وینەی هەلواسراوی سەرەك و پادشاکان لە فەرمانگەکانی حکومەت و، هیی ناو پوولەکانی پۆستە، ببیتە وینەیەکی

(تاقانه).. ئەمە خواستێکە، دژی شیعرو، دژی شاعیریشە.. هەموو داخوازیی من ئەوەیە کە وێنەی شاعیر نەکرێتە پێخۆری بەدحاڵیی بوون و، شێواندنی بە ئەنقەست. ئەم کتێبەش، کە هەندێ هەڤپەیڤینی رۆژنامەوانیی و تەلەفزیۆنیی خۆمم سەبارەت بە مەسەلەی ژن تێدا کۆکردۆتەوە، هەوڵدانێکە بۆ راستکردنەوەی ئەو وێناکردنە کۆنەی کە لە یادەوەریی خەڵکدا لە بارەی منەوە چەسپاوەو، گۆڕینی ئەو وێناکردنەیە بە وێناکردنێکی زیاتر مۆدێرن و، زیاتر ئینسانیی.

بەیروت ١٥/٩/١٩٨١

نزار قەببانی

*نزار قەببانی، لە پێناوی ژندا چیت کردووە؟

–جا چییم نەکردووە لە پێناویدا؟

چل ساڵە ئەز (ژن)م بەشان هەڵگرتووەو، هەر لە کەنداوەوە تا ئۆقیانوس، بە برژانگەکانم ڕێ دەکەم و سەفەری پێدەکەم.. لەو سەفەرەدا، ژن لەسەر هەر تۆپەڵە لمێک خەوتبێت، لە جێیدا دارخورمایە پەلوپۆی هاویشتووەو، چاوەی ئاوێك هەڵقوڵیوە..

هەر کەسێك، لە شەقامی شارە عەرەبییەکاندا، ئەوی لەگەڵ مندا چاوکردبێت.. وای زانیوە گوڵەباخێك دەبینێت.. هەر حوکمڕانێکی عەرەبیش، ژنی لە تەنیشتمەوە بەدەی کردبێت، داوای لێکردووم کە پێی بفرۆشم.. زێڕی زۆرو کۆشکی گەورەو پۆشاکی حەریری خستۆتە بەردەستم.. کاتێکیش پۆزشم بۆ هێناوەتەوە لەوەی مێینەکەمی پێ

نافرۆشـــم، فـــەرمانی داوە ســـــەری خـــۆم و ســـــەری خۆشەویستەکەشـم بەتۆمـەتی دەسـت تێکــەڵاوکردنم لەگــەڵ ئیمپریالیسـتەکان و، تۆمــەتی دڵداریکــردن بــۆ وەرگرتنـــی مۆڵەتی وەزارەتی ناوخۆ، بپەڕێنن.

دەپرسیت: چیم لە پێناوی (ژن)دا کردووە؟

ئەز پارێزەری ژن بووم لە دژی شەیتان..

بــە کۆمــەڵ دەعـوای جــەزاییم لــە دژی پیــاوانی عــەرەب تۆمارکردووە، بە تاوانی ترساندنی ژن و، بێدەنـگ کردنـی و، کڕیـــن و فرۆشـــتنی و، زەلیلکـــردن و رەتاندنـــــەوەی و، تــالاّنکردنی ســـەروەتی جەســـتەو عـــەقڵی.. وەك چـــۆن ئینگلیزەکان موستەعمەرەکانی ئەفریقایایان تالاّن دەکرد.

چل ساڵە، جێگـەی ئـەز دادگاکانـەو، (لائیحـە) پیشـکەش دەکـەم و، دەچمــە (مورافـەعات)ەوەو، داوای هێنـانی شـایەت دەکـەم و، ئـەو ئامێرانـەی تاوانــەکانیان پــێ ئــەنجام دراوەو کراســـی ژنـــە غـــەدر لێکراوەکـــان دەخەمـــە بـــەردەمی دەستەی دادوەران..

بـــەڵام (پیـــاوی ســـپی).. هەمیشـــە بێتـــاوانیی خـــۆی نیشانداوەو نکوڵی لە ئەنجامدانی تاوانەکەی کردووە..

چیم کردووە لە پێناوی ژندا؟

دەشێت گرنگترین ئەو دەستکەوتانەی کە هێناومەتە دی، من بووم ناوی (ژن)م لە لیستی خواردەمەنی هێنایە دەرێو.. لە لیستی گوڵەکاندا دامنا..

ناوی (ژن)م لە لیستی زەوی و زارو موڵك و سامان و پارەدا سڕییەوەو، خستمە لیستی ئەو کتێبانەی دەخوێنرێنەوە.. جەستەی (ژن)م لە ناو لیستی ئەو بەرخۆڵانەی چاوەڕوانی سەربڕین دەکەن و، ئەو گۆلکانەی چاوەڕێی پێست گۆڕین دەکەن، سڕییەوەو خستمە ناو لیستی ئەو مۆزەخانانەی کە سەردان دەکرێن و، ئەو سیمفۆنیایانەی گوێیان لێ دەگیرێت.. ئەز بووم، مەمکەکانی (ژن)م کە بە درێژایی مێژوو بە بارمتە گیرابوون، وەك جووتێ کۆتر رەهای ئەو ئاسمانە کرد کە راوە مەمکی سپی ی، پیشەیەتی..

(ژن)م وەك گوڵە مینایەکی سپی لە سنگ و بەرۆکی خۆم داو، بەو گوڵە مینایەوەو، بەسەر پشتی ئەسپێکی سپییەوە، خۆم بەو شارە عەرەبییانەدا کرد کە بە نهێنی عیشق دەکەن.. ئەو شارانەی دەترسن لەوەی تەوقە لەگەڵ ژنێکدا بکەن، نەبادا دەستنوێژەکانیان بشکێت..

هەر لەبەر ئەوەش بوو، شاوری پۆلیسەکان کەوتنە دووم و، دواتر وێنەکەمیان بەسەر دیواری شەقامەکان و بەقەدی درەختەکانەوەو هەڵواسی و، خەڵاتێکی گەورەشیان بۆ هەر کەسێك دانا کە سەری خۆم، یان سەری یەکێك لە دیوانە شیعرییەکانمیان بۆ ببات..

بە کورتی، من بووم (مێژووی ژنان)م نووسیەوە، یان لانی کەم هەوڵمدا بینووسمەوە..

ژنان بۆ؟

بۆچــی ئــەم پانتاییــە گەورەیــەم لـــەکاتی خــۆم و.. لـــە تەمەنم و.. لە دیوانەکانم بەخشییە ژن؟

بۆچی کاتی خـۆم لەگـەڵ ژنـدا بـەفیڕۆ ئـەدەم و.. بۆچـی دەچمە ناو دالآنە لەولەبییەکانیەوەو، مەرەکـەبم لـە گـردو کـۆو نوسینەوەی وردەکارییەکانیدا بەکار دەبەم؟

ئەی ئەگەر کاتی  خـۆم لـە پـەیبردن بە ژنـدا بـەفیڕۆ نـەدەم، چما لە پەیبردن بە پیاو بەفیڕۆ بدەم؟

پیــاو بـــەو پێکهاتەیـــەی کـــە هەیـــەتی، مـــەخلوقێکی ناشیعرییە.. پیاو؛  وشك و.. ناسازو.. سیما قورسە.. پیاو؛ هەر کە قۆناغی زانکۆی تەواو کرد، ئیتر پەیوەستیی خۆی  بە شـیعرەوە دەپچڕێنـێ و.. جگـە لـەو رۆژنامەیـەی کـە بــەدڵی خۆیـەتیو، جگـە لـە خشـتەو لیسـتی نرخـەکانی (بۆرسـە).. هیچی تر ناخوێنێتەوە..

پیـاو ناچێتـە کتێبخانەیـەك بـۆ ئـەوەی دیوانـە شـیعرێك بکڕێـــت.. ناشـــچێتە دوکـــانی گوڵفرۆشـــێك بـــۆ ئـــەوەی گولیك بکریت..

کـەچی ژن، هـەتا دوا چرکـەی ژیـانی خـۆی، لـە بـەردەم عاتیفەی جوان و.. وشەی جواندا دەتویتەوە..

پیاو، بەددانەکانی قەسیدە دەخوات..

کــەچی ژن بەشــەوقەوە نۆشــی دەکــات و، چـاوانی پــێ دەریژێت و.. چەشنی ئەلقەی زمروت دەیکاتە گویچکەکانی..

**ئەی گەشتەکەت لەگەڵ ژندا.. بەرەو کوییە؟**

—دەریاوانی بە ئەزموون ناپرسیت (بەرەو کویێ)..

دەریـاوانی بـە ئـەزموون، ئاسـۆو.. شــینایی دەریــاو.. ماســیو.. ســەدەف و.. شــینکە بــەردەکانی نــاو دەریــاو.. باڵندەکـــانی نـــەورەس و.. نادیـــار (مجـــهول) دەکاتـــە پیخۆری خۆی..

ئـەزیش لەگـەڵ (ژن)دا، دەریـاوانیکم بایـەخ نادەمـە ئـەو بەندەرانـەی هاتوونەتـە بـەردەم گەشـتە دەریاییەکـەم، بەقـەد ئـــەوەی بایـــەخ ئەدەمـــە ئـــەو بەندەرانـــەی کـــە هیشتاکە دەرنەکەوتوون..

ئەوانەشی ئەم پرسیارە دەکەن، وینـای (ژن) وەهـا دەکـەن ئەو چەمە.. یـان ئـەو جۆگـە بچکۆلەیەیـە، دەکـرێ لـە مـاوەی پینج دەقیقەدا ئەمبەر بۆ ئەوبەری ببریت.. بێ ئەوەی بزانـن ژن؛ بەرینترین و قووڵترین و ترسناکترین دەریاکانە..
بیرۆکـەی تۆبەکردنم لـە شـیعری ژن ئـامیزی خـۆم، کـاری نەکردەیەو، هـەروەها بیرۆکـەی وازهینـانم لە دەریاوانیی نیـو زەریا قووڵەکان، بیرۆکەیەکی ترسنۆکانەو بێمانایە..

ئـەز، پـەرەی ناسـنامەکەم لـەت و پـەت ناکـەم و.. ناشـبمە ئوتوبوســـیك بـــۆ کــــارکردن لــــە کۆمپیانیایـــەکی هاوبەشی گواستنەوەدا..

هەرگیز دارستانی خۆشەویستی جێ ناهیلم.. وەلی هـەوڵ ئەدەم درەختی سـەیرو تـازەی تیـدا بروینـم..، شـەتڵ و تـۆوی جیا لەوانەی ئیستای بۆ بهینم و، دەیان ریگەی تازەی بچووك بچووکی تیدا رابکیشم و.. دەیان بیری ئاوی تیـدا لیبـدەم، بـۆ ئــــەوەی ئــــەم دارســــتانی خۆشەویســــتییە ببیتــــە دارستانیکی نموونەیی..

سەبارەت بە (ژن)یش، ئەوە هەرگیز نامەویت پەیماننامەی ئەوەی لەگەلدا مۆربکەم کە رۆژێ لە رۆژان پەیوەندی لەگەلدا بپچرینم.. چونکە پەیوەندیی پچراندن لەگەڵ (ژن)دا، مانای پچراندنی پەیوەندییە لەگەڵ شیعرو، لەگەڵ ژیانیشدا..

پاشان کێ دەلیت (ژن) دەیەویت پەیماننامەیەکی لەوجۆرە کە دەبیتە مایەی زەلیلکردنی میینەتی‌ی خۆی، ئیمزا بکات..

ئەرکی بنەرەتیی میینەتیی؛ گردوکۆپیکردن و یەك پیگرتن و لەئامیزگرتنە.. نەکەی باوەر بەوە بکەیت کە ژنیك بە جددی بیر لەوە بکاتەوە سەرپیچی‌ی یاسا سەرمەدییەکانی میینەتی بکات.. چونکە لەم جۆرە حالەتەدا، ئەو ژنە بەیاخی و پیلانگیری دژ بە رەگەزی خۆی لە قەلەم ئەدریت..

من، هەرگیز کەنارەکانی (ژن)م جێ نەهیشتووە، تاکو بگەریمەوە بۆ لای..!

کێ هەیە لمی گەرم و، سەدەفەکان و، گژوگیاکانی دەریاو، سیمفۆنیای شەپۆل و با، جێ بهیلیت و، شوینی نیشتەجیبوونیشی بگۆریت؟

پاشان چ مانایەك لەوەدایە نووسەر، ژن ئەفەرۆز بکات..؟ ئەگەر وای کرد، مانای وایە لیدانی دڵ و سووری خوینەکەی خۆی ئەفەرۆز دەکات و، دەچیتە خانەی بەردبوون و مەرگەوە..

کەسیك ژن ئەفەرۆز دەکات کە خۆی بووبیتە بزماریَ.. یان هۆمۆسیکسوالیك.. کەسیکیش، ژن ئەفەرۆزی دەکات کە خوینبەرەکانی وشك هەلاّتبن و، شیوەی ژیشکیشی گرتبیت..

نووسەر، ئەوکاتە بەشەنگ و شۆخیی دەمینیتەوە کە لە سایەی ژنداو لەژیر چەتری پاراستنی ئەودا بیت.. کاتیکیش (ژن) دەستبەرداری پیاو دەبیت، ئەوکات، تەمەنی پیاو لەیەك سالدا، هەزار سالّ بەرەو پیریی هەلدەکشیت و، بەچەشنی فیلی ئەفریقیی، لەتاو بیزاریی و، جەستەو سیما قورسیی، خۆی دەکوژیت..

ئیوە بۆچی نووسین لە بارەی (ژن)ەوە بەکاریکی ناوزرین دەزانن؟ یان ئەگەر شاعیریك عیشق بنوسیتەوە، بە گومرای لە قەلەم ئەدەن و دەلین پیویستی بە کەسیك بیت چارەسەری بکات؟

ریم بدە پیتان بلیم؛ کۆمەلی عەرەب خۆی شیتە، چونکە ناتوانیت عاشق بیت و، ناشزانیت عاشق بیت..

هەروەها ریم بدەن پیتان بلیم، گەلان، ئەوکاتە پیَ دەنینە چەرخی دارمانەوە کە توانای عیشق و پەیوەندیی گرتنی بەردەوامی ئینسانیی لەدەست ئەدەن.. پاشان ریم بدەن پیتان بلیم، ئەو نیشتمانەی کە بەر هەمان دەستووری دەست بەسەردا گرتنی پارەی ساختەو جگەرەی قاچاخ و حەشیشەو تلیاك؛ دەست بەسەر قەسیدەکانی خۆشەویستیدا دەگریَ.. ئەوە نیشتمانیکە شایانی ئەوەیە گریانت بۆ کلۆلییەکەی بیت!

*نازناونی "شاعیری ژن" یان بەسەردا بریویت.. ئەم نازناوە مانای چیی دەگەیەنیت؟

-چ مانایەك ناگەیەنیت..

ئەوە (لەزگەیەکی پزیشکیی) بوو، رۆژیك لە رۆژان، رۆژنامەگەریی خستیانە سەر پیستەکەم و، هەتا ئیستاش بەدەست ئاسەواری شین هەلگەراوی ئەو لەزگەیەوە دەنالینم..

راستە ناوبانگ دەرکردن بەدەولەمەندیی باشترە لەناوبانگ دەرکردن بەهەژاری و.. ئەوەی بە کۆلۆنیا خۆی دەشوات بەختەوەرترە لەوەی کە بە سرکە خۆی دەشوات و.. نووستن لەسەر پیخەفیك کە لە پەری چۆلەکە بیت، جیا لە نووستن لەسەر تەختیکی بزمار ریژو.. پشیلەش هەروەك دەلین- لە ئاهەنگی زەماوەند هەلنایەت.. هەموو ئەمانە راستن.. بەلام ئەوەش راستە کە ئەگەر ئەگریجەکانی ژن زیاد لە پیوست لەمل بئالین، ئەوا شیوەی پەتی سیدارە وەردەگرن..

ئەز شاعیری پیاوو.. ژن و.. سەرجەم پەیوەندییە مرۆییەکانم.. هەروەها -لەگەڵ ئەوپەری خۆشەویستیمدا بۆ ژن- ئەز نامەویت بەم شیوە شیتانەیە بخنکینم و.. قەبولم نییە بەتەنێ لەناو جەستەی ژندا- نیشتەجیکردنی زۆرەملی (الإقامة الجبرية)-م بەسەردا بسەپینریت..

خواستی من ئەوەیە کە لە جەستەی هەموو دنیادا بم..

***ئـــەو (ژن)ە کییـــە کـــە ئامـــادەبوونی خـــۆی بەســـەر شاعیردا دەسەپێنێ؟**

–ئـەو (ژن)ەی کـە ئامـادەبوونی خـۆی بەسـەر شـاعیردا دەسـەپێنێ، ئـەو ژنەیـە کـە جاریکی تـر (هـەلی بشـیلیتەوە) و هــەموو میــژووی بســریتەوە، بــۆ ئــەوەی ســەرلەنوێ ئــەو میژووە بنووسیتەوە.

ئـەو ژنەیــە کــە زەمــەنی تایبــەتی‌ی پیــاو دەســریتەوەو دەیخاتە ناو زەمەنی خۆیەوە..

ئەو ژنەیە کە بە ئامادەبوونی ئەو، زەمانیش ئامادە دەبیت بە رۆیشتنیشی، زەمانیش دەروات..

ئــەو ژنــەی، وەك چــۆن پشــیلەیەکی میینــە گەمــە بــە شلیلەیەکی خوری دەکات، ئەویش ئاوا گەمە بە کات دەکات و رۆژی شــەممە دەکاتــە یەکشــەممە.. هــەینیش بــە پیــنج شەممەو.. بەلینیکت لە مانگی ئۆکتۆبەردا ئەداتێ، کەچی لە مانگی (جەمادی‌ی یەکەمدا) دیتە ژوانت..

ئەو ژنەیە کە سیستمی کۆمەلەی خۆر دەگۆریت و.. لـە سـۆنگەی ئەوەشـەوە ئەسـتیرەیەك بـە فـەرمانی ئـەو نـەبیت هەلنایـەت و، لـە نیـوان هــەردوو مــەمکی ئەویشــدا نــەبیت؛ ئاوا نابیت..

ئەو ژنــەی کـە شـەهوەتی نووسـینمان دادەگیرسـینیت و، قەســـیدەمان پـــێ دەخاتـــەوە، وەك چـــۆن ئیمـــە منـــدالٚ بەو دەخەینەوە.

ئەو ژنەی ئامادەبوونی خۆی دەسەپینیت، ژنیکە سەر بەگۆبەند.. بروسکەژن.. ژنی– بوومەلەرزەیە.. ژنی– تۆفانە.. ژنی– پرسیارە.. ئەو ژنەیە، کە نازانیت لەکوێو، بۆ کوێو، کەیو، بۆچی لەگەلیدایت؟

ئەو سمۆرەیەیە کە لەسەر رەفەکانی کتیبخانەو.. ناو سەرچەفەکانی پیخەف و.. گولدانەکاندا وازی دەکات و.. وەك چۆن خرمە بەدەنکە بوندوقیکەوە دەکات، ئاواش خرمە خرم بە پەنجەو کاغەزەکانی شاعیرەوە دەکات.. ئەو ژنەیە کە ئەبجەدییەت لیك هەلدەوەشینیتەوەو.. شاعیر هان ئەدات کە بە تەنها لە پیناوی ئەودا، زمانیکی تر بخولقینیت..

ئەو ژنەیە، کە سەرت دەبریت، وا دەکات چیژ لە تامی خوینە گەرمەکەی خۆت وەربگریت و.. کە لە نیو باسکەکانی خۆیدا دەتنیژیت، بۆ بەیانی دەبیتە گولە گەنمیك..

ئەو ژنەیە کە ناونیشانی هەرچی ژنی تر هەیە دەیسریتەوەو، سەرجەمیان وەك پروپاگەندەیەك لیدەکات..

ئەو ژنەیە، دیوانەکانم ریك دەخات و، وەها مامەلەم لەگەلدا دەکات کە مندالیکی تەمەن دوو مانگانەم و.. هەروەها ئەو ژنەیە، قەلەمی رەنگاورەنگم ئەداتێ بۆ ئەوەی رەسم بکەم و. فرۆکەی کاغەزیم بۆ دروست دەکات بۆ ئەوەی پیی بفرم..

دواجار، ئەو ژنەیە دەستی خۆیم ئەداتێ تا لەسەری بنووسم و، قژیم پیدەبەخشیت تاکو خۆمی پێ داپۆشم..

*لەو بروایەدای کە بوونـی ژن لـە شیعرەکانتدا، هۆیـەك بـووە بۆ نـاوو شۆرەتت؟

-بە پیچەوانەوە.. من لەو بروایـەدام کـە شـیعری مـن بۆتـە هۆیـەك لـە ناوبـانگ دەرکردنـی ژن دا.. (بوسـەینە)، بـە بـێ شیعری (جمیل)، کچە دەشـتەکییەکی زۆر نەناسـراو بـووە.. (لـەیلای عامریـە) بە بێ شیعری (قـەیس) کچیك بـووە کـەس نەیناسیوە.. (ئیلزا تریولی).. بە بێ شیعری ئاراگۆن.. ژنیکـی فەرەنسی بووە وەك هەزاران ژنـە فەرەنسیی تـر کە رۆژانـە لـە شـەقامەکانی شـانزیلیزێ و مۆنمارتـەرو بۆلڤارسـان میشـال دەپەرنـەوە.. ئەوکاتەشـی ئـاراگۆن، (چاوەکـانی ئیلـزا)ی نووسـی.. ئیـتر چاوەکـانی ئیلـزا ئـەو رەهـەندە شـیعرییەیان وەرگرت کە پیشتر نەیانبوو..

سـەرەراش، ئامـادەبوونیکی وای بەخشـییە ئیلـزا کـە لـە میـژووی ژنـانی بهینیتـە دەرەوەو، بیخاتـە نـاو میـژووی ئەدەبەوە..

خەتـەرناکیی شیعر ئالیرەدا حەشار دراوە.. بۆیـە کـاتیك شـیعر بـەر شـتەکان دەکـەویت، گەوهـەر و پیکهاتـەیان دەگۆریـن و.. کـاتیکیش شـیعر بـەر ژن دەکـەویت، سـەراپای ناوونیشـان و رەگەزنامـەیان دەسـریتەوەو دەیکاتـە ژنیـك لـە رەهابووندا..

حەقیقـەتی ژن، چـەندە فـرە بـن، هەریـەك حەقیقەتـە.. بـە مانـای ئـەوەی کـاتیك مـن لـە بـارەی ژنیکـی دیـاریکراوەوە دەنوسم، هاوزەمان لە بارەی هەموو ژنانی دنیاوە دەنووسم..

*ژن، ناونیشــانی خــەونی عەرەبییــە، هــەروەك چــۆن ئـــەو دیوارەشە کـە سـەرجەم دیاردەکـانی دواکـەوتنی عـەرەب لـە شـیوەی زنجیرەیەك تراژیدیای چەوساندنەوەی یەك لەدوای یەکدا، شانیان داداوەتە سەری.. لیرەوە، گـەلی تۆمـەت دراونەتـە پـالْ هەلویسـتی نـزار قــەببانی شــاعیر ســەبارەت بــە ژن.. هەلویســتی تــۆ بــە دیاریکراوی، لە کویدایەو.. ئەی پیگەی ژن لەکویّ تۆوەیە؟

-هیـچ رۆژیـك، ژن خـەونی پیـاوی عـەرەب نـەبووە، بـەلام هەموو رۆژیك ژن، بە بارمتە گیراو و ئاژەلی بەردەستی پیاوی عـەرەب بـووەو، ئـەو مەزرەعەیـە بـووە کــە خواسـتە میژووییـە دەرەبەگیتییەکـەی خـۆی لـەناودا پیـادە کـردووە. ئەگـــەر ژن خـەونیکی عـەرەب بوایـە، ئـەوا کۆمەلگـەی عـەرەبیش باخچـە دەبوو.. مانگ و فوارەی ئاو دەبـوو.. ئەوساکەش بوونـی مـن، یـاخود بوونـی کتیبـەکانی شـیعر، چ پیویســت نــەدەبوون.. چونکه ئەویّ دەمیّ هەموو پیاوان دەبوونـە شـاعیرو بـە زمـانی کۆتـران لەگـەلْ ژنـدا ئـەدوان و.. گولـە وەنەوشـەیان دەرخـوارد ئـەدان و، بازنگـەکانی خۆریـان لـە مەچـەك دەکـردن.. بــەلام پیاوی عەرەب سەروساختی لەگەلْ خەوندا نییـەو.. ناتوانیت لــە پــەیوەندی خــۆی لەگــەلْ میینــەدا ببیتــە شــاعیر.. رەگ ریشــەی قەبیلەگــەریتی و دەرەبەگایــەتیی پیــاوی عــەرەب، ئەوەی بەسـەردا سـەپاندووە کـە مامەلـەکردنی لەگـەلْ ژنـدا، چەشــنی مامەلــەکردنی بیــت لەگـــەلْ زەویو زارو، تـــۆوی چـــاندن و، ســـامانی ئـــاژەلی وەك ئەســـپ و بـــالندەو کەرویشکەکان.. ناشزانم بۆچی هەندیك جار ئەو هەستە دام

دەگریت کە پەیوەندیی نیوان پیاوی عەرەب و ژنی عەرەب (پەیوەندی زەوی و مولکە) و هەمان ئەو ریساو پەیوەندییانەی بەسەردا دەچەسپیت کە لە مامەلەی کرین و فرۆشتنی زەوی و مولکدا هەن، وەك: بینین (المعانیة) و پارەدان و بە مولك کردن (الاستملاك).

پیاوەتیی، هەروەك کۆمەلی پیاوسالاریی ئیمە وای تیدەگات بریتییە لە شکاندن و، سەرکوتکردن و، سرینەوەی ئیرادەی مێینە.. هەموو سیستەمەکانیش وەك یەك وان، لە سیستمی باوکسالارییەوە بۆ سیستمی میردسالاریی، ژن لە زیندانیکەوە دەگۆزیریتەوە بۆ زیندانیکی تر.. لە پیاویکی پۆلیسی نهینی‌ی لیکۆلینەوەوە دەگویزیتەوە لای یەکیکی تری هاوچەشن..

سەرکۆنەشم مەکەن گەر بلیم، زۆربەی پیاونمان لە پەیوەندییان لەگەڵ ژناندا وەك پۆلیسی نهینی‌ی لیکۆلینەوەن..

نەکەن فریو بە تویکلی دەرەوەی ئەو پیاوە عەرەبە بخۆن کە لە ئەوروپاوە دەگەریتەوەو جانتایەکی سامسۆنایتی پییەو سێ کتیب و چەند گۆڤاریکی تیدایە.. ئەویش هەمان پۆلیسی نهینی‌ی لیکۆلینەوەیە، بەلام لە بەرگی رۆشنبیریکدا..

سەبارەت بە من، وەك شاعیریك لە گۆبەندی ژنەوە تیوە گلاوەو لە تەکیا گەیشتۆتە خالی نەگەرانەوە، ناتوانم ئەوە بلیم کە ئەز پیاویکی عەرەب نیم.. منیش زەرەیەك لمی ئەو

سـەحرايانەم کـە تينويتـــی و خەمـــەکانی خۆيـــان بـــەکيش دەکـەن.. بــەڵام خــۆ لانــی کــەم، ئــەز پۆليســيکی نــهينیی ليکۆلينـەوە نـەبووم و، بەبێ دادگايی چ ژنيکم نـە ئاخنيوەتـە زيندانەکانمەوە..

دۆسيەی شيعرييم بە دريژايی سی ساڵ، سيخناخ بووە بە هەموو جۆرەکانی کيشەی ژنان.. ئەم (دۆسـيە)يـەش وەنـەبيت دۆسـيەيەکی نـهينی بيـت.. بـەلکو دۆسـيـەيەکە لــە شـيوەی چەندين ديوانە شيعردا چاپ و پەخش و دابەشکراوەو لەبەر دەستی سەرجەم شايەت و سويندخۆرەکاندايە..[1]

ئـەوەی لـە بـارەی ژنــەوە نووســيومە، وەنــەبێ شــتيکی داهيـــنراو يـــاخود دانـــراو بيـــت، بـــەلکو هـــەروەك زاراوە سەربازييەکە دەليت، بريتييە لە موعاناتيکی (مەيدانيی)..

ژنانيش، وەك پياوان، هەر هەموويان قەدديس و.. نەرم و نيان و.. قوربانيی نين.. چونکە قوربانيی، رەگـەز ناناسيت.. دەشيت ئـەو قوربانييـە ژنيکـی ناسـك و روون بيـت چەشـنی فرميسـکەکانی کريسـتاڵ، دەشکرێ ئـەو قوربانييـە پيـاويکی سميلدارو بازوو ئەستوور بيت و دەمانچەشـی هـەلگرتبيت.. ژنـــان ئـــەو دنيايـــەن، تيـــايدا ســـپی و، رەش و، ســـوورو، خۆلەميشــی هەيــەو.. تيــايدا کۆتــرە ژن و.. پشــيلە ژن و.. ناسـکە ژنيـش هەيـە.. هـەروەها ژنـی شەرانگيزيشـی تيدايـە.. لەو دنيايەدا ژنـی وای تيدايـە؛ شيعر لـە چاوانی دەباريت و،

---

[1] ليرەدا نزار مەبەستی لە سويند خۆرەکان، -هيئة المحلفين-ی دادگايـە- وەرگير.

ژنیشیی تیدایە کە چاوانی نە شیعرو، نە پەخشانیشیان لێ ناباریت.. بۆیە دۆسیەی شیعری من، لەگەڵ ژناندا، دۆسیەیەکی ئەستوورەو، تیایدا تۆمەتەکانیش زۆرو زەوەندن؟.. جاری وا هەبووە قەسوەتم بەرامبەر ژن نواندووەو، جاریش هەبووە ئەو قەسوەتی بەرامبەر من نواندووە.. بەڵام بەشیوەیەکی گشتی شەری ئەز لەگەڵ ژندا، شەریکی عادیلانە جوان بووە.. سەرەرای ناکۆکیەکانم لەگەڵ هەندیك لە ژنان زۆربەی ناکۆکییەکانیش لەسەر خوانی شیعر بەرپا بوون– بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ژن، هەر هاوریم بووەو، کیشەکەیم بە کیشەی خۆم زانیوەو.. لەبەردەم هەموو دادگاکانی– بەدائەو ئیستیئناف و تەمیز–دا، پاریزەری ژن بووم..[2]

ئەز، هەتا مردن خۆم بە لیپرسراو دەزانم بەرامبەر کیشەی ژن.. بەڵام پیویستە ژنیش بەرپرس بیت بەرامبەر خۆی.. چونکە شەر شەری خۆیەتیو، ناتوانیت لەریێ بەکریگرتنی سەربازی ئینکیشارییەوە کە لە جیاتی خۆی شەری بۆ بکەن، جەنگ بباتەوە.. ژن بۆی ناکریت بەهۆی وەکالەت یان نماینده یی کەسیکی تر بۆی، یان بە پسوولەیەکەی پەسەندکراوی لای دادنوس (کاتب العدل)، هیچ جەنگیك بباتەوە

ژن، ئەگەر سڵ لەوە بکاتەوە کە کراسە سپییە ئاودامانەکەی

---

[2] ناوی دادگاکان وەك خۆیان دانراون، چونکە لە زمانی کوردیدا و تاکو ئیستا ناویکی شایستەیان بۆ نەبینراوەتەوە– وەرگیر.

بەرپرژەی شەپۆلەکانی ئاو دەکەویت، ئەوا بۆی نالویت لە دەریا نزیك ببیتەوە.. بۆیە ئەوکاتەی ژن لە کەناری دەریادا بە دەم چاوەروانیی پۆلیسی فراکەوتن یاخود پۆلیسی ئیشککگری کەنارەکانەوە رادەوەستیت.. ئەو راوەستانی چاوەروانییە بە فریای ناکەویت و، چ هەوالیکی نوێی لە بارەی رەشەباو زریانەکانی دەریاوە پێ نابەخشیت. ئازادی، بریتیە لە بەرپرسیاریتی و موعانات و هەلمەتبردن و.. پیویستە ژنی عەرەب پشت بە هیزە خودییەکانی خۆیو بە ستراتیژە تایبەتییەکەی خۆی ببەستیت، نەك پشت بەستوو بیت بە سەربازی بەکریگیراوو تیمەکانی بیگانە کە عادەتە لە نیرینە پیك دین..

سەبارەت بە ئاهەنگی رۆژی جیهانیی ژنانیش، جگە لەوەی ئاهەنگیکی کۆکتیلەو دوای تەواوبوونی ئاهەنگەکە، داوەتکراوان، پیاو لەگەڵ پیاوداو، ژنیش لەگەڵ ژندا، چۆن داوەتکراون.. هەر بەوجۆرەش ئاهەنگەکە جێدیلن.. چ شتیکی تر نییە..

*ئەو ژنانەی لە قەسیدەکانتدا قسە دەکەن و دەبزوین و عیشق دەکەن، ئایا ژنانی راستەقینەن.. یاخود لە خولقاندنیاندا فانتازیای شیعریی رۆلی سەرۆکی دەبینیت..؟ بەدەربرینیکی تر، ئایا ئەوانە وینەی لە بەرگیراوەی راستەقینەی واقیعی عاتیفیی و جنسیی عەرەبن، یان بۆ زیاد لە پیویست پالەوانە ژنەکانت دەکەیتە قوربانیی ئارەزووە نیرینەییەکانی عەرەب..؟!

–له شیعردا وینەیەك یان نوسخەیەك نییە پێی بوتریت (وینەی لەبەرگیراوە). شاعیر ئامیری (فۆتۆکۆپیی) نییە تا لە ماوەی چەند دەقیقەیەکدا دەیان وینەی خیرا فۆتۆ بکات..

چاوی شاعیر، بە هەزاران ئامـاژەو دیمەن و شەپۆلی تیشکاوەر راو دەکات، دواتر هەڵاویرییان دەکات و پوختەیان دەکات.. دواجار بەشیوەیەکی نوێ وینەکە پیك دەهینیتەوە..

وینەی جیهان، ئەوکاتەی بە گلینەی شاعیردا تیدەپەریت، وینەیەکی رەش و سپییە.. دوای ئەوەی لە پەنجەرەی دلیەوە دیتەوە دەرێ، دەبیتە وینەیەك کە بە سەرجەم رەنگەکانی پەلکە زیرینە رەنگ کراوە..

سەبارەت بە (ژن)ەکانیشم، بەهەموو دلنیاییەکەوە دەیلیم، ئەز ئەوانم لە دوورگەکانی (واق واق)ەوە نەهیناون و.. بە شیوازی (کۆلاژ)یش پیکەوەم نەلکاندوون و لە هیچ تاقیگەیەکی کیمیایشدا ئاویتەی یەکتریم نەکردوون.. ئەوانە، ژنانیکی عەرەبن، ناوی خۆیان و، ناونیشان و، ئەدگارە سایکۆلۆژیی و جەستەیی و کۆمەڵایەتیەکانی خۆیانیان هەیە.. بەڵام پاش ئەوەی دەچنە تاقیگەی شیعرەوە، ناوەکانی یەکەمجاریان و ناونیشانە دیارەکانی خۆیان ون دەکەن و.. لەناو کەمۆڵەی تاقیکردنەوەدا، جگە لە ماددەیەکی سەوز کە تیشکیکی نارروونی هەیەو ناوی دەنیین شیعر هیچی تریان لی نامینیتەوە.

*هەلویست لە بارەی ژن و خۆشەویستییەوە، ئایا هەمان هەلویستە کە پێشتر هەتبوو.. یاخود ئەو ڕووداوە هەڵایساوانەی کە گەمارۆی ناوچەکەیان داوە، هەندێ گۆرانکارییان بەسەر ئەو هەلویستەدا هیناوە؟

–ژن و.. پیاوو.. خۆشەویستی.. ئەمانە هەموویان ئاکامە بەدیهاتووە میژووییەکانن. بە واتایەکی تر، ناکرێ باس لە پیاوو ژن بە دابراویی لە ڕووداوە کۆمەڵایەتی و ئابووریی و سیاسییەکان بکریت.. هەر قۆناغیك هەلویستی تایبەت بە خۆی و، شیعری تایبەت بەخۆی و (موفرەداتی) تایبەت بە خۆی هەیە..

ئەوە قسەیەکی بێ مانایە گەر بیلیم، ئەوەی ئەمرۆکە لە بارەی خۆشەویستییەوە دەینووسم، جیاوازە لە نووسینەکانم لە بارەی هەمان مەسەلەوە لە چلەکانداو.. ئەو ژنەی لە سالآنی پەنجاکاندا پیایدا هەلم گوتووە، جیایە لەو ژنەی لە هەشتاکاندا پیایدا هەلدەلیم..

لە چلەکاندا، ژن لەلای من، مامزێ یان گولیك.. یاخود پەپوولەیەکی بەهاریی بوو.. دواترو لە پەنجاکان و بەرەو ژوورتردا، ژن بووە ئەو خاکەی شەرمان لەسەری و لە پیناویدا دەکردو.. ژن بەشیکی سەرەکییە لە نیگەرانیی و خەم و چەپاندن و سەرکوتکردن و کابوسەکانی ئەم ناوچەیە.. لەم رۆژگارەدا، کاریکی زەحمەتە بتوانیت بچیتە خەلوەتی خۆشەویستەکەت بێ ئەوەی پۆلیك فرۆکەی جۆری F16 کە چەند فرۆکەوانیکی ئیسرائیلی دەیئاژوون

بەنیوانتاندا فرکە نەکەن و بۆمباکانیان بەسەر سەری تۆو.. خۆشەویستەکەتدا نەبارینن و.. نەچن عەقڵ نەسووتینن، هەر لە دایەنگەو زانکۆو.. قەڵەم و.. دەفتەرو.. یارییەکانی منداڵو.. کتێبەکانی بیرکاری و ئەندازەوە.. تا دەگاتە سەرجەم سەرچاوەکانی زانست..

لەمرۆکەی عەرەبدا، خۆشەویستی مەحکومە بە سیاسەت.. تەنانەت وای خەیاڵ دەکەم کە هەر چیرۆکیکی هاوچەرخی خۆشەویستی لەم کۆمەڵەدا، بە ئامیرگەلی گویرادیری (التنصت) و رادارە ئیسرائیلیەکان گەمارۆ دراوە.

***دوای سی ساڵ نووسین، ئایا لەو بروایەدایت کە توانیوتە سیستم و لۆژیکی (مەزرەعەی بە کۆمەڵ) بگۆریت و وەکی تر توانیوتە شتیك لە نەخشەی خۆشەویستی لەلای عەرەب بگۆریت؟**

–نەخشەی خۆشەویستی لە دنیای عەرەبدا، نەخشەیەك نییە لە کاغەزو کارتۆن دروستکرابیت.. بەلکو نەخشەیەکە لە بەرد.. چوونە ناو دیالۆگیشەوە لەگەڵ بەرددا، رەنگە ئاکامەکەی گەیشتن بیت بە شیتی.. یان بە شیعر.. یاخود بە هەردووکیان.. بیگومان ئەز ناتوانم لە ماوەی چارەکە سەدەیەکدا، دریژایی دە هەزار کیلۆمەتر لەو تەلە درکاوییە بە ددانەکانم ببرم[3] کە کۆمەلی عەرەبی بە دەوری خۆشەویستیدا گیراویەتی.. ئەمە پیویستی بە وەرشەیەك لە شاعیران هەیە کە ماوەی سەد ساڵ کار بۆ لابردن و نەهیشتنی ئەم هەموو

---

[3] بقرتینم– وەرگیر.

پەردووە کەلەکەبووەی بزمارو وردە شووشەی شکاوو لوغمە چینراوەکانی ژێر زەوی بکەن..

سەرەراش، نووسین وەك ئاوی ژێر زەمین وایە کە بە شینەیی دلی زەوی هەلئەدریت.. لیرەشەوە هەر قەسیدەیەك کە دەیخوینیتەوە، تۆویکی یاخیبوون لەژێر پیستماندا جێ دەهیلیت و، لە ناخماندا پریشکیکی توورەبوون دادەگیرسینیت و لە ئاکامی کۆبوونەوەی ئەو هەموو پریشکەشدا، ئاگریکی گەورە هەلدەگیرسیت.. سی ساڵ نووسینی شیعری خۆشەویستی بەس نییە بۆ گۆرینی لۆژیکی شارەکانی مس و خویٚ.. بەلاٚم لەگەڵ ئەوەشدا، وا هەست دەکەم ئەو نەخشەی خۆشەویستییەی من کیشاومە، بۆتە نەخشەیەکی رەسمیی ناو قوتابخانەکانی نیشتمانی عەرەب..

***چۆن بۆ شاعیر دەلویت کە لەیەك کاتدا، بەهەردوو ئاراستەی ژن و شۆرشدا کاربکات؟**

–ئیوە خۆشەویستی لە کونی دەرزییەکدا توونە دەکەن و. ئەوەتان لەبیر دەچیت کە شۆرشگیری بزورگ، هەر دەبیت عاشقیکی بزورگ بیت.. ئەوەی ژنیکی خۆش بویت، نیشتمانیکی خۆش دەویت و.. ئەوەی روخساریکی جوانی خۆش بویت، جیهانی خۆش دەویت..

ئەز ناتوانم، خەباتگیریك لە شیوەی بزماریك یاخود بەردیکدا وینا بکەم، وەك چۆن ناشتوانم عاشقیك بەبێ خەمی شۆرشگیرانە وینا بکەم..

گرفتەکە لەوەدایە، فەشەل و گرێ جنسییەکانمان وایان لێکردووین کە نەتوانین خۆشەویستی بەبێ ژن و جوگرافیای جەستەی ژن، وێنا بکەین.. لەو باوەڕەدام ئەمە دیاریکردنێکی ساویلکانەی خۆشەویستی بێت.. ئەو کاتەی ئەز شیعرم بۆ ژن نووسی، مەبەستم نەبوو پەیماننامەیەکی ئەبەدیی لەگەڵ جەستەیدا ئیمزا بکەم تا بەپێی ئەو پەیماننامەیە هەر شیعرێك بۆ ئەو و بە بالآی ئەودا نەبێت، نەیلێم.. لای من خۆشەویستی ئاویزانبوونی کەون و، ئاویزانبوونی مرۆڤە.. نیشتمانیش، لە قۆناغێك لە قۆناغەکاندا دەشێت ببێتە ئەو عەشیقەیەی جوانترینی هەموو عەشیقەکان بێت..

***تۆ بانگەشەت بۆ ئازادیی ژن کردووەو بەردەوامیش بانگەشە دەکەیت..بڵێی ئەم بانگەشەکردنە ژنانی نزیك بەخۆشت بگرێتەوە، بۆ نموونە وەك کچەکەت، یان خوشکەکەت؟**

—بە بێ هیچ دوودڵییەك..

ئەز کاتێك خۆر بە دەستەکانم هەڵدەگرم، بۆ ئەوەیە دنیای پێ ڕۆشن بکەمەوەو.. لەوەشداماڵەکەی خۆم نابوێرم..

بێ ماناترین بانگەشە بۆ ئازادیی ئەوەیە کە ببێتە شمەکێك بۆ هەناردەی دەرەکی (تصدیر خارجی) و هیچی تر.. من لە بیرو کردەوەکانمدا، چیرۆکەکەی دکتۆر جایکڵ و میستەر هاید پراکتیزە ناکەم.. بەڵکو بەر لەوەی ئاگر لە کراسی کەسانی تر بەردەم، لە کراسی خۆمی بەرئەدەم..

*تــــۆ شـــــاعیریکیت، بابــــەتی ســــەرەکیی شـــــیعرەکانی، خۆشەویسـتییە. بـەڵام ئـەم خۆشەویسـتیە، خەریکـە دەبیتــە ئــەو خۆشەویستییە مادییەی کە پەیوەندییەکەی تووندوتۆڵی بـە ژیـانی رۆژانەوە هەیە.. چەمك و تیگەیشتنی تۆ بۆ خۆشەویستی چییە؟

–خۆشەویستی، کشانی بوونەوەرەکانـە بەرەو یـەکتری و زیــاتر لیــك نزیکبوونەوەیانــە لــە یــەکتری بــە مەبەســتی یەکگرتن و فرەبوون..

هەموو بوونـەوەرەکان لـە سـای پالنـەری عیشـقدا بـەرەو یــەکتر دەکشــین و مــەحکومن بــە ئەرکــە بایۆلۆژیــایی و کیمیاییـەکانیان نـەك بـە بـیرورا میتافیزیکییـەکانیان، چونکـە میتافیزیکا منداڵ ناخاتەوە..

ئەگــەر قەدیســـەکان و، تۆباوییــەکان و، شـــاعیران و، پاکیزەییـەکان و، ئەوانـەش لـە رووی جنسـییەوە بـێ توانـان؛ هینده بەتواناو دەسترەنگین بن کـە بتوانن شیرینی خـەون و، جوانیـی خـەیالکردن، بەسـەر جەسـتەی خۆیـان و جەسـتەی خۆشەویسـتەکانیاندا بـپرژینن، ئـەوا کـار ئاسـانییو بـوار رەخسـاندنیان بـۆ دەکـەین لـە پینـاوی ئـەوەی شـاکارەکانی شیعرو رۆمان و مۆسیقاو شیوەکاریمان پێ ببەخشن..

بــەڵام کردنــە ژوورەوەی شــیعر بــۆ نـــاو (کـــەرەنتینا)و، دابرکردنـــی عاشـــقان لـــە یـــەکتری و، پاکژکردنـــەوەیان لـــە ئارەزووەکانی بەشـەرو، لـە شــەهوەتەکانی بەشــەر.. ئەمـەیان جۆریکـە لـە خەتەنـەکردنی زۆرەو ملـی و.. مەلەکردنـە لـە دژو پیچەوانەی ئاراستەی هیزی راکیشانی زەوی..

شانۆی راستەقینەی خۆشەویستی، ژیانی رۆژانەیە، گازینۆو، باخچەی گشتی و، شاخ و کیلگەو، سینەماو شانۆکانە..

خۆشەویستی، لە کووچەو کۆلانە تەنگەبەرەکاندا دەخەویت.. لەبەر باراندا تەر دەبیت.. لە بەردەم کوشکی رۆژنامەفرۆشاندا رادەوەستیت.. قاوەی ئیکسیبەرو بەرسۆ دەخواتەوە.. هەموو جۆرە جگەرەیەك دەکیشیت.. سواری شەمەندەفەرەکان دەبیت و.. لە هۆلی ترانزیتی فرۆکەخانەکاندا چاوەروان دەبیت.. دەچیتە ریستۆرانەکان و هیچیش ناخوات.. رۆژانە هەموو رۆژنامەکان دەکریت و کەچی لە هیچیش تیناگات.. نمایشە شانۆییەکان دەبینیت و کەچی هیچیش نابینیت..

من، لە بارەی ئەو جۆرە خۆشەویستییەی سەرەوە، دەنووسم..

***شیعری تۆ پرە لە وینەی هەستیارانە (الحسی)، تەنانەت خوینەر خەریکە دەست دەخاتە سەر دەستی ئەو ئافرەتەی کە وەسفی دەکەیت.. ئایا واقعیەت وا لە شیعر دەکات، شیعریکی هەژار بیت یاخود دەولەمەندی دەکات؟**

-ئەگەر خوینەر بتوانیت دەست بخاتە سەر دەستی ئەو ئافرەتەی کە ئەز لە بارەیەوە دەنووسم، یاخود بتوانیت یاری بە پرچە قەرەجییەکەی بکات، ئەوا پیویستە سوپاسم بکات بۆ ئەو نیعمەتەی کە باراندوومە بەسەریا..

هـــەرگێڕیش ئـــەوەم بـــەلاوە گرنـــگ نـــەبووە، لـــە بـــارەی خۆشەویســـتییەکەوە بنووســـم کـــە نـــەمبینیوەو (شـــەرەفی ناسینیم) پێ نەبراوە..

ئـەز، هەسـت و گۆشـی خـۆم لـە وڵاتـی تـرو، لـە ئـەدەبی وڵاتانی ترەوە ناهینم.. دەشێت (چاوەکانی ئیلزا)ی ئاراگۆن قەسیدەیەکی جوان بیت.. بەڵام قەسیدەی (عیون المـها بـین الرصافه و الجسر)یش هەر جوانە، چونکە لەمیاندا، شەوو، کل و ، بۆنی تیژی قاوەو، میژووی هەموو پیاوانی قەبیلە.. خۆیان حەشار داوە..[٤]

چاوانی عـەرەبی، هینـدەم سـیحر پیدەبەخشـن کـە بەشـم بکات و.. بە شەوقیکی وەها ئاورشینم دەکەن کە بەردەوامیی دایالۆگم لەگەڵ میژوو و، لەگەڵ زەمیندا بۆ دەستەبەر بکەن.. تاقە بابەتی عیشقی من، ژنی عەرەبە.. ئەز لە شیعرمدا مامەلە لەگەڵ ژنانی ئەستیرەکانی تردا ناکەم.. لەبەر سادەترین هۆ، ئـەویش ئەوەیـە، نایانناســم و.. لـــە هیـــچ ریســـتۆرانتیکی بـــەیرووتدا شـــیوم لـــە گـــەلدا نـــەکردوون.. ژن لـــەلای مـــن پیکهاتەیەکی زەینیی نییەو، بیرۆکەیەکی رووت نییە تاکو لە دووتوێی کتیبەکاندا. بیخوینمەوەو، هەروەها میوەیەك نییە لە بیستانەکانی خورافەتدا.. ژن، روخساری دووەمی مـانگ نییە، بەلکو مانگ خۆیەتی.. وینەی دەریا نییە لە تابلۆیەکی زەیتییـدا، بـەلکو خـۆی دەریایـە.. فریشـتەیەك نییـە لـە

---

[٤] ئەو دیرەی سەرەوەم، بۆیە نەکردە کـوردی، چونکـە بـە عەرەبییەکـەی زیاتر ناسراوو ئاشکرایە لای هەموان– وەرگیر.

فریشتەکانی نێو ئەفسانەکان، بەلکو خۆی فریشتەیەکی ڕاستەقینەی مۆدێرنەو، کاوبۆی دەپۆشێت و، لەگەڵ مۆسیقای دیسکۆدا سەما دەکات و، ئۆتومبیلی سەقفکراوە دەئاژوێت..

ئەز، (ژن)ەکانی ناو شیعرم لە ڕۆمان و فیلمە ئەمریکیو ئیتالی و فەرەنسییەکانەوە ناخوازم.. رەنگە کەسی تری غەیری من بتوانن (بە چاویلکەوە) خۆشەویستی بکەن و بە چاویلکەشەوە شیعر بنووسن..

بەڵام ئەز بە کاڵای تەواوی مەیدانەوە دەچمە نێو خۆشەویستیەوە.. سا ئیتر یان سەردەکەوم.. یاخود دەچمەوە بەر بارەگای خودا..

پێشتریش ئەوەم وتووە؛ کەسێك ناتوانیت لە بارەی دەریاوە بدوێت ئەگەر تیایدا غەرق نەبووبێت و، لە بارەی ئاگرەوە بدوێت ئەگەر لە ناویدا نەسووتێ‌و، لە بارەی عیشقیشەوە بدوێت ئەگەر عاشقانە شامەرگ نەبووبێت..!

بۆیە نووسین لە بارەی ژنیکەوە کە نایناسین، ئەوە بۆ خۆی ساختەکارییەکە کاغەز بەرگەی ناگرێت و، درۆیەکیشە، یاسا سزای بۆ داناوە..

***ئایا تێڕوانینت لە ئێستادا بۆ ژنی ئەمرۆکەی عەرەب، هەمان تێڕوانینی پێش چارەکە سەدەیەکە بۆی؟**

–ژنی عەرەب گۆڕاوەو.. منیشی لەگەڵ خۆیدا گۆڕیوە.. ئەو زیرەکترە لە جاران و خۆشەویستیی ئەزیش بۆی

شارستانیتر بووه.. ژن له شەرابدانە (قاروره)کەی خۆی هاتۆتە دەرێو، ئەزیش لە دەشتەکیتی‌ی خۆم دەرچووم.. گرنگ ئەوەیە ئەز بگۆریم.. پیاو بگۆریت..

ژنیش رووەکەی تری منە..

ئەگەر چەشنی گولیك مامەلەی لەتەکدا بکەم، ئەوا بۆنەکەی خۆیم پیدەبەخشیت.. خۆ ئەگەر وەك قوربانییەك مامەلەی لەتەکدا بکەم، ئەوا خوینەکەی دەرژیتە سەر کراسەکەم و.. ئەگەریش وەك کەنیزەکیك مامەلەم لە تەکدا کرد، ئەوا تووشی دارمان دەبیت و ئەزیش بەهۆیەوە دادەرمینیت..

بە بێ بوونی پیاویکی ئازاد.. ژنیك نییە ئازاد بیت..

***چۆن ( بە شۆرگیرکردنی ژن ) وینا دەکەیت و.. لە کویوە دەست پیدەکات؟**

-سەرەتا بە شۆردنەوەی دەماغی پیاوی عەرەب دەستپیدەکات لە هەموو ئەو بیرورایانەی کە بە دریژایی سەردەمەکانی (زیندە بەچالکردن) و داگیرکارییو، راو وشکارو، چەتەگەریتیی کەلەکە بوون.

دواتر ئازادکردنی عەقلی ژن لەو خەونانەی کە تیایاندا وەك بووکەلانیکی سیرامیك، بێ جوولەو دەستەو ئەژنۆ دادەنیشیت و چاوەرێی کەسیك دەکات کە بیکریت..

داواکراو، شۆرشیکە بە دوو قۆناغ: قۆناغی یەکەمیان، دەبیت ئاراستەی پیاو بکریت، بۆ ئەم مەبەستەش پیویستە

پەیامی ئەم قۆناغە دراندن و لەت و پەتکردنی ئەو قەوالە میژووییەی (تاپۆکردنە) بیت کە پیاو لە قاسە ئاسنینەکەی خۆیدا هەلی گرتووەو، بەپیی ئەو قەوالەیەش هەموو مافەکانی خۆی دەرهەق بە ژن؛ هەر لە کرین و فرۆشتن و.. رەهن کردن و.. دەست بەسەرکردن.. تاکو دەگاتە جیٚهیشتن و تەلاٌقدان، پیادە دەکات..

قۆناغی دووەمیشیان؛ دەبیت ئاراستەی مالی زیندان ئاسای ژن بکریت و دەست بگیریت بەسەر شووشە عەترو کل و کلدان و، بۆیەو بربەندی نینۆك و، مقەست و، دەرزیی دەمبوس و، سووراوی لیوو، ستیانی تەلدارو، ئەنگوستیلەو، گوارەو، بازنگ و سەرجەم ئەو (کەرەسەی ئیش)ەی کە ژن بۆ هەلکوتانە سەر پیاوو بە بارمتەگرتنی چ وەك دیل و.. چ وەك میرد.. بەکاریان دەهینیت.

***هەندیٚ کەس گومانی ئەوە دەوروژینن کە شیعری تۆ بانگەشەیەکی راشکاوە بۆ وردوخاشکردنی ئەو کەلەپوورە ئەخلاقییەی کە لە رۆژهەلاٌتدا باوە.. وەلاٌمت بۆ ئەم تۆمەتە چییە؟**

-ئەگەر مەبەستت لە کەلەپووری ئەخلاقیی باوی رۆژهەلاٌت، مافی پیاو بیت لە (کرۆژتنی) ئیسکی ژن و، بەکارهینانی جەستەی وەك مەزرەعەیەك کە هەر کاتیك بیەویت بیکیلیٚ و دواتریش هەر کاتیك بیەویت بەروبوومەکەی بدووریتەوە.. ئەگەر وابیت، ئەوا ئەز بەختەوەرم بەو تۆمەتەی کە دراوەتە پالم..

ئەگــەر تۆمــەتباركردنم لـــەوەوە هـــاتبێت كـــە داوای پراكتــیزەكردنی یاســای (دەرەبــەگیتی‌ی ژن) بەســەر پیــاوو دەســت بەســـەرداگرتنی ژنــە زیادەكــانی دەكــەم، وەك چــۆن یاســای ریفۆرمــی كشــتوكالیی، زەوی زیــادە لــە دەرەبـــەگ دەسەنیتەوە.. ئەوا من بەختەوەرم بەو تۆمەتباركردنە..

خۆ ئەگـەر تۆمـەتبار كردنەكەشم لـەوەوە هـاتبێت كـە ئـەز بانگەشەی ئەوەم كردبێت كە مامەلەكردن لەگەڵ مێینـەدا لـەو روانگەیـەوە بێت كـە مێنیـە؛ رۆح و.. كەرامـەت و.. بەهایـە.. نـەك ئـەو قوربانییـەی هـەناوی هـەلكۆلین و، لـەژێر پـەردەی (ناموس پەرستیدا) گۆشاوگۆش سەری ببرین.. ئـەوا ئـەز بـەو تۆمەتباركردنە خۆشنوودم..

من روخساری ئەوانە چاك دەناسمەوە كەدادگاییم دەكەن و، ناوی یەك بە یەكیشیان دەزانم.. ئەوانـە، ئەو پیاوانـەن كـە شانیان داداوەتـە سـەر مێژوو، ئەوانـەی لـە كـەوتن و نـەمانی دەستكەوتە زەمەنییەكانیان و، لە بەرپا بوونی شۆرشێك لەناو زیندانی ژناندا، دەترسین و.. سڵ لەوە دەكەنـەوە ژن داوایـان لیبكـات بچنــە ژێـر چـەتری گوێرایەلییانـەوە..! ئەوانـە؛ ئـەو پیاوانەن لەوە دەترسن كـە ژن شـوو بەچوار پیـاو بكـات، وەك چۆن ئەوان چوار ژن دەهێنن.. هەروەها لەوەش دەترسن ژنـی عەرەب یاسای (ددانێك بە ددانێك و، چاوێك بە چاوێك) یـان بەسەردا پراكتیزە بكەن و بەوەش بێ‌چاوو، بێ‌ددان بن.[٥]

---

[٥] ئەم یاسایە لەكاتی خۆیدا حامورابی دایناوە، ناوەرۆكەكەش ئەوەیە كـە هەركەس چاوی كەسیكی تر كوێر بكات، دەبێ چاوی كوێر بكرێتەوە یـان

پێویستە بەزوویی دەستبەرداری ئەوە  بین کە (جەستەی ژن)مان کردۆتە پێوەری ئەخلاقیی شەهامەت و شەرەفمان..! لێرەشەوە پێویستە بەرپرسیاریتی‌ی ئەخلاقیی، بەشێوەیەکی یەکسان دابەش بکرێتە سەر جەستەی پیاوو ژن پێکەوە.. عەدالەت لەوەدا نییە کە جەستەی نێرینە گولباران و، جەستەی مێینەش چەقۆو تیرباران بکەین.. ئەم حوکمە قەرەقووشییە لەسەرەتاوە بۆ کۆتایی، حوکمێکی رەتکراوەیە.

***ئایا لە ژیانی تایبەتی خۆتدا، بەهەمان ئەو ناسکی و شاعیریتییە مامەلە لەگەڵ ژندا دەکەیت کە لە قەسیدەکانتدا، مامەلەی لەگەلدا دەکەیت؟**

–لە هەموو شیعرەکانمدا نەرم و نیان نەبووم لەگەڵ ژندا.. لەگەڵ هەندیك ژن، نەرم و نیان بووم و، لەگەڵ  هەندیکیشاندا پیاویکی کیویی بووم.. لە ژیانیشمداو هەر بەو جۆرەو لەگەڵ هەر ژنەو بەشێوازیك مامەلە دەکەم کە لەگەڵ جۆری (نەوعی) ئەو ژنەدا بگونجێ کە پیی دەگەم.. ماقولیش نییە کە هەلویستەکانم هەموویان یەك جۆر هەلویست بن بەرامبەر سەرجەمی ژنان..

ئەز، نە کۆمەلەیەکی خێرخوازییم و، نەش خاوەنی ئارایشتگای ژنانم تاکو پیشەکەم ئەوەم بەسەردا بسەپێنیت

---

کەسێ ددانی کەسێکی تر بشکێنێ، دەبێ ددانی بشکێندرێتەوە– وەرگێر.

کـه بـەدەم هـەموو ئـەو ژنانـەوە پیبکـەنم کـە دینـە سـالۆنی ئارایشتگەکەم.

شاعیر، بوونەوەریکی رۆشناوەرو، قەددیس و، سۆپەرمان نییە.. بەلکو مرۆڤیکە وەك سەرجەم مرۆڤەکانی تر؛ هەندێ جار رازییەو، هەندێ جاری تریش توورە دەبیت و، هەلدەچیت و، لیبوردنی هەیەو، شیتگیریش دەبیت.. لەو حالەتانەش کە (ئەعصابی) دەسووتینریت[٦] هەرچییەکی بکەویتە بەردەست ئەیدۆرینیت، لەوانەش وینەو نامە پیرۆزەکانی خۆشەویستەکەشی.. رەنگە کەسانیکی کەم لە ئەهلی شارەزا ئەوە بزانن کە شەرو ناکۆکی لەگەلّ ژندا وەك خوێی چیشت وایەو، سەرچاوەیەکە لە گرنگترین سەرچاوەکانی شیعر..

لە کاتیکدا ئاشتی و ئاشت بوونەوە لەگەلّ ژندا دەبیتە مایەی خستنەوەی مندالّ.. بەلاّم شیعر ناخاتەوە..

***بەو پییەی تۆ کوچکەیەکیت لە کوچکەکانی خۆشەویستی.. ئایا باوەر بە عیشقی ئاراگۆن بۆ ئیلزا تریۆلی دەهینیت؟**

ئایا هەتا ئیستاش ئەم دیمەنانەی عیشق لە بەردەم کارەساتەکانی کوشتن و، هەژاری و، کلۆلی و برسیتیدا.. بەتایبەتیش لە جیهانی سییەمدا، مایەی بروا پیهینانن؟

-.. ئەی بۆچی بروا نەکەم؟

---

[٦] واتا ئەوپەری توورەی دەکەن- وەرگیر.

خۆشەویستی لە روانگەی منەوە، قەرەبووکردنەوەی عادیلانەیە لە بەرامبەر سەرجەم رەفتاری دزیوو خراپەکارییو تاوانەکانی ئەم دنیایەدا..

تەقینەوەی بۆمبیک هەرگیز پشکوتنی گولە مینایەك ناسریتەوە.. هەروەك چۆن وەشاندنی خەنجەریك، ماچیم ناسریتەوەو، میشیك جیگە بە پەپوولەیەك لەق ناکات و.. فرۆکەکانی جۆری F15 و F16 ریٚ لە هاتنە دنیای منداڵان ناگرن و.. زیندانەکانیش، ئازادی لەناو نابەن..

رەفتارە نامرۆییەکان بەتەنها لە جیهانی سییەمدا روو نادەن.. بەلکو لەهەموو جییەکدا هەن و.. دەشیت ئیمە لەم دەڤەرەدا، حالمان لە خەلکی تر چاکتر بیت.. چونکە هۆرمۆنەکانی فرمیسك و شیعر هیشتاکە لەلای ئیمە لەکاردان.. -سوپاس بۆخوا- کە هیشتاکە ئیمە توانای عیشقکردنمان هەیە.. راستە ئیمە لەناو برسیتی و تینویتی و سەرکوتکردن و شکستدا بەردەوام دەمرین و، لە سەرەتای هەر هەفتەیەکدا ئەوان فرۆکەکانیان دەنیرنە سەرمان تاکو دەواری (لەیلا) و (قەیس) بۆردوومان بکەن، بۆ ئەوەی نەهیلن باسی شەوق بکەن و.. شیعرو منداڵ بخەنەوە..

بەلاّم ویرای بۆردوومانی فرۆکەکان، هیشتا مەجنونی لەیلا سەلامەتەو، لەیلاش دوای نوستنی باوکی، بەردەوام پیشوازی لە مەجنون دەکات..

***تۆ پشتیوان و داکۆکیکار بوویت لە ژن.. لەو بروایەدایت کە شیعرەکانت یارمەتیدەر بوون بۆ رزگارکردنی ( ژن ) لە ستەم و زۆر؟**

–شیعر وەك پەنسلینی زەیتی، کاریگەرییەکەی هیواش و لەسەر خۆیە.. نەك تیمیکی پەرەشووتەوان بیت و شەبەیخوون دابەزیتە سەر فرۆکەخانەیەك و لە ماوەی نیو سەعاتدا داگیری بکات..

رزگارکردنی ژن، وەك رزگارکردنی فەلەستین وایە.. بە پارانەوەو نزاو نەزرکردن نایەتە دی.. بەلکو پیویستی بە بیست تیمی گیانبەخشی ژنان هەیە.. بیگومان یەکەمین نیشانەی ستراتیژییش پیاوەو[٧] هەتاکو پیاو لە گریکانی دەسەلاتداریتی و، خۆپەرستی و، نەرجسییەت رزگار نەکریت و، هەتا نینۆکە تیژەکانی نەقرتینرین و، هەتا دەماغی پیاو لە گۆتاوەرۆ داگیرکردن و تالانکردن و دەستبەسەردا گرتنی کەنیزەکەکان دانەشۆردریت، ئەوا چ ریگایەك بۆ گەران بەدووی رزگارکردنی ژندا بەدی ناکریت.. ریژەی سێ لەسەر چواری پیاوانمان ئەندامن لە یانەکەی (ابو زید الهلالی)دا.[٨] هەتاکو یاداشتی گرتنی (مذکرة توقیف)ی سەرجەم ئەندامانی ئەم یانەیە دەرنەکریت و، یانەکە خۆشی بە مۆمی سوور مۆر نەکریت.. ئەوا (ابو زید الهلالی) بەردەوام بەخۆی و تەورداس و شەروالەکەیەوە کوچە بە کوچەی ولات دەگەریت بۆ ئەوەی سەری هەر کچە قوتابییەك کە کاوبۆی لەپیدەکات، بپەرینیت..

---

[٧] مەبەستی لە نیشانە لیرەدا، نیشانەیە بۆ پیکان (هدف للاصابە) – وەرگیر.

[٨] دیارە نزار ئەم ناوەی وەك ئاماژە بۆ پیاوسالاری بەکارهیناوە– وەرگیر.

له سیستمی پاش و پیشخستنی ئەرکە پیویستەکاندا، رزگارکردنی پیاو بە پلەی یەکەم دیت و.. ئەز هەتاکو ئیستاش باوەرم بەو ریسا گشتگیرییە هەیە کە دەلیت:

"پیاویکی ئازادم بدەرێ و.. ژنیکی ئازاد ببە".

***وەك شارەزایەك لە خۆشەویستیدا، ئایا راستە ئەوکاتەی پیاو، چەند ژنیك دەبنە هاورێی، زیاتر هەست بە کەم توانایی خۆی دەکات لە هەلبژاردنی یەکیکیاندا؟**

–له جەنگی جیهانیی دووەمدا، سوپای ئەلەمانی هەموو ئەوروپای داگیرکردو، هیچ شوینیکیشی تیایدا قۆرخ نەکرد.. زۆربوونی ژن لە ژیانی پیاویکدا وەك ئەو وردەواله فرۆشەی لیدەکات کە لەناو ئەو هەموو وردەوالەیەدا وردو درشتی شمەکەکان لیك جیانەکاتەوە.. هەندێ جاریش ئەو کاریگەرییەی کە (یەك ژن) دەیکاتە سەر پیاویك، هەرچی بوومەلەرزە هەیە وەها کاریگەریەك ناکەنە سەر تویژالی گۆی زەوی.. هەروەك چۆن پیاویکی ساغلەمیش ناتوانیت دە کراس لەبەر بکات، ئاواش لە توانایدا نییە کە دە ژن پیکەوە بکاتە بەرخۆی.. چونکە ئەو کۆگەرمییە (الحرارة الجماعية) نابیتە مایەی خۆ گەرمکردنەوە. ئەو پیاوەشی پیت دەلیت: دوینێ شەو لەگەل دە ژندا بووم.. ئەوە بزانە لەگەل هیچ ژنیکدا نەبووەو.. بە تاقی تەنیا لە پیخەفەکەی خۆیدا نووستووە..

***بەوە تاوانبارت دەکەن کە لە شیعرەکانتدا وەها مامەلەت لەگەڵ ژندا کردووە کە شمەك یان کەل و پەلیکی تری تەواوکەری دیکۆرەکانی شەوو، ماڵ و پیخەفە.. رای تۆ چییە؟**

–(شەهریاریەتی) هەرگیز پیشەی من نەبووە.. شیعرم ئەو تەختەی شانۆیە بووە کە هەزاران نموونەی بەشەریی جوولەی خۆیان لەسەر کردووە.. لەو هەزارانەش پیاو و ژنی چاکیان تیدابوون و، هاوزەمان پیاووژنی خراپیشیان تیدا بوون..

ئەو ژن و پیاوانەی ئەز لە بارەیانەوەم نوسیوە، شتاقیان لە داهینان و دروستکردنی خۆم نەبوون.. ئەوەی لەبەردەستی مندا بووە، جیهانی یان دنیای عەرەب بوو، ئەو دنیایەی دەرەبەگی ئابووری و، جنسی و، سیاسیو، هەروەها خۆرافات و، سیحرو، جادووگەرییو، ئەستیرەوانییو، پزیشکەوانیی عەرەب، کۆنترۆلیان کردبوو. کاتیکیش باسی ئەو (دەرەبەگیتییە جنسی)یەم لە شیعردا کرد کە پیاوی عەرەب پیادەی دەکات، وەك لە قەسیدەکانم (ژنیکی سك پر) و دەزوولە خوینەکانی برینیکی هەوکردوو) و.. (دەنگێ لە حەریمەوە) و (رۆژانەی ژنیکی بێ موبالات)..ئەوکات ئەوە لە زەینمدا بوو کە ئەم دیاردەیە ریسوا بکەم و پەردەی لە روو هەلبمالم.. کەچی هەتا خاوەن ماڵ دزی گرت، دز خاوەن مالی گرت!! چونکە ئەوکاتەی لە قەسیدەکانمدا دەستم بۆ ئەو دیاردانەی لادان (الانحراف) برد کە باسم کردن، لە دارشتنی رستەکان و دەربرینە شیعرییەکاندا، شیوازی قسەکەرم

بـەکارهێناوە (واتــا شــاعیر ڕانــاوی کەســی یەکــەمی تــاکی بــەکارهێناوە– وەرگــێر)، چونکــە ئــەم شــێوازە لای مــــن، شـێوازێکی زیـاتر دراماییـە.. کـەچی خـەڵکی، لـە ئـەنجامی خوێندنـەوەی خێراو سـەرپێیانەدا، خۆیـان لـە پێداویسـتیو بنەماکانی پرۆسەی نووسینی شیعر نەبان کردووەو.. وەکی تـر لـە دژی مـن ڕژاونەتـە سـەر شـەقامەکانی قســەو قســەلۆكو خۆپیشاندان دەکەن..

قەسیدەی شـیعر، تۆمـاریك نیـە بـۆ دادوەریو، هـەروەها لائیحەیەکی تۆمەتبارکردن نییە، ئاراستەی شاعیری بکەین.. چونکــــە شـــــاعیر؛ شـــــایەتی ســــــەردەمەکەی خۆیــــەتیو.. بەرپرسیارە لە تاوان و بیشەرەفییەکانی ئەم سەردەمە..

***تـاوانبـارت دەکەن بەوەی: هـەنديك جـار داکۆکـی لـە ئـافرەت دەکەيت و بـانگەشەی ئازادی ئەو دەکەيت.. کـەچی هـەنديك جـاری تر هەلويستی هاوچەشنی هەلويستی ( هـارون الرشيد ) و ( ابـو زيـد لهلالی )ت بەرامبەری هەيە.. هەروەك لە قەسيدەی ( خۆشەويســتی و پەترۆل )دا دەليیت:**

کەی تێدەگەیت؟

ئاخر گەورەم کەی تێدەکەیت

کە من عەشیقەیەك نیم وەك عەشیقەکانی ترت؟

ژمارەیەکیش نیم لەو ژمارانەی بە تۆمارەکانتا ڕەت دەبن؟

ژنێکـی داگــیرکراوی تــر نیــم بخریمــە ســەر ژنــە داگــیر کراوەکانی ترت..

کەی تیدەگەیت؟

هەروەها لە قەسیدەی (رەسمکردن بە وشەکان)دا دەلییت:

جانتاکانم لە سەفەری دوورو دریژدا ماندوو بوون..

خۆشم لە ئەسپەکەم، لە شەرەکانم ماندووبووم

مەمکیکی رەش، یاخود سپی نەمایەوە

ئالأکانم لە زەوییەکەی نەچەقینم..

گۆشەیەك لە جەستەی چ شۆخیکدا نەمایەوە

گالیسکەکانم بەسەریا تینەپەرن

عەبایەکم لە پیستی ژنان کردو

چەندین ئەهرامیشم لەگۆی مەمکان دروست کرد..

–ئیوە بۆچی شیعر لنگەوقووچ دەخويننەوە؟

قەسیدەی یەکەمیانم، خانمەکەم[9]، لوتکەی ئەو قەسیدانەمە کە بۆ داکۆکیکردن لە ئافرەت نووسیومن. ئەو قەسیدەیە بە زمانی ژنیکەوە کە سەر بە چینی ناوەندە لە دژی هارونە رەشیدەکانی پەترۆل (نەوت) نووسراوە.. قەسیدەکەم لە سالأنی پەنجاکاندا نووسیوەو هەر رۆژیکیش کە بەسەریا تیدەپەریت، ئامادەبوونیکی تازەی پیدەبەخشیت[10] و وای لیدەکات لەگەڵ واقیعی حالدا زیاتر بگونجیت، نەخوازەلأ پاش ئەوەی ریکخراوی (ئۆپیك) نرخی

[9] پیدەچیت ئەم پرسیارە خانمیك لە نزاری کردبیت لەکاتی چاوپیکەوتن و هەڤپەیڤینەکەدا– وەرگیر.

[10] واتا رۆژگار لەگەڵ تی پەرینیا ئامادەبوونی تازە بەو قەسیدەیە دەبەخشیت– وەرگیر.

نەوتی زیادکردو وای لیهات بەنرخی یەك بەرمیل نەوت، دە ژن بیتە کرین کە پیشتر یەك ژنی پیّ دەکررا!! سەبارەت بە قەسیدەی (رەسمکردن بە وشەکان)یش کە وەك نمونەیەك بۆ سادییەت و شەهریارییەتی من دەیهینیتەوە، لە بنەرەتدا ئەو قەسیدەیە لە دوو دیمەنی سەرەکی و تەواوکەری یەکتری پیك دین بەشیوەیەك جیانەکریتەوە لە یەکتری. دیمەنی یەکەمیان، دیمەنی داگیرکردنی جنسییەو، هی دووەمیشیان، دیمەنی دامرکانەوەو.. کەوتن و.. بیّهیواییە لە جنس..

بەلاّم چی لە دلّ و دەروونی نەخۆشەکان دەکەیت کە تەنها نیوەی یەکەمی قەسیدەکە دەخویننەوەو، ئیتر بە هەمان دەستووری (ولا تقربوا الصلاة)ەکە، نیوەکەی دووەمی دەسرنەوە.. لە کاتیکدا ئەم نیوەیەی دووەم بربرە پشت و تەوەرەی سەرەکیی قەسیدەکە پیك دەهینیت و، لەم قەسیدەیەشدا گەمەی روناکییم بەکارهیناوە[١١] وەك چۆن وینەکیش لە پیناو ئەوەی شۆك (صدمە)یەك لە بینینیدا دروست بکات، یاری بە هەردوو رەنگی رەش و سپی دەکات.. بەشی دووەمی قەسیدەکە دەلیت:

.. ئەمرۆش، وەك دز لەسەر پشتی کەشتییەکەم دادەنیشم،

بە دووی ریگەی دەربازبووندا دەگەریم

---

[؟؟] واتا وەك شیوازیکی هونەریی یاریی بە رووناکیی کردووە- وەرگیر

كليلى حەريمەكە با ئەدەم..
كەچى لە سيبەرەكەدا جگە لە كاسە سەرى مردووەكان
چى تر بەدى ناكەم..
كوان كەنيزەكەكان؟ كوان ژنە زۆرو زەوەندەكانم؟
كـــوان ئـــەو بخوردانـــەى، بەرامـــەيان بـــە ژوورەكـــانمدا
پەرش دەبيت..
ئەورۆكە.. مەمكەكان تۆلەى خۆيان دەكەنەوەو
وەلامى هەر زاميك، بەزامى تر ئەدەنەوە..
جنس ئەو مادە بيهۆشكەرە بوو تاقيم كردەوەو
كەچى نە كۆتايى بەخەمەكانم هينا، نە بەگرفتەكانم..
خۆشەويستيش؛ هەر هەمووى وەك يەكى ليهات
وەك ليكچوونى گەلاكانى نيو دارستان..
د ەمى شيرينى تۆ، كيشەكەى من چارەسەر ناكات
كيشەى ئەز لە دەفتەرو لە مەرەكەبدانەكەمدايە..
هەموو ريگەكان لە بەردەممان‌دا داخراون و
فرياد رەسيشمان، لە (رەسمكردن بە وشەكان) دايە..

٢٣

*شيعرى تۆ هەميشە خەسلەتبەندە بەوەى كە سـنووردار نييـە.. لەبـــەر ئـــەوەى بەشـــيوەيەكى رەهـــاو بـــۆ هيـــچ ديـــاريكردنيكى چينـايەتـىو.. بۆ ئەوەى سەرنج بدەينە ئەوەى كـە ژنـانيكى عـەرەب

هەن ئازادن و.. تیاشیاندایە هەتا ئەوپەری بەرەڵایی ئازادە؛ تۆ داکۆکی لە ژنی رۆژهەڵات دەکەیت..

–هانام بە دەمت و خوا بکات وابیت کە تۆ دەیلێیت.. تۆ زیاد لە پێویست گەشبینیت.. ئەز بریارم داوە ئەو کەسە خەڵات بکەم کە ژنێکم پێ نیشان بدات عەقلی ئازاد بووبیت.. ئازادییەکی راستەقینە..

خانمەکەم! لەبەرکردنی کاوبۆی شین ئازادبوون نییەو.. لە ملکردنی زنجیرە مەعدەنییەکان ئازادبوون نییەو.. چوونە سینەما لە سەعات (سێ)وە بۆ (شەش)ی ئێوارەو.. ئاژوشتنی ئوتومبیل.. ئەمانە ئازادبوون نین.. تەنانەت چوونە زانکۆ، هیچی ئەوتۆی لەو خەسلەتانەی بیری ژنان کە ئێمە دەیزانین، نەگۆریوە.. کچێکی خوێندکاری زانکۆ وەك نەنکی بیر دەکاتەوەو هەلس و کەوت دەکات و، شوو دەکات..

ئازادی، ئەو ئاگرەیە هێشتاکە چ ژنێکی عەرەب بە شێوەیەکی جددی پێی داخ نەبووە.. ئەو ژنەی باسی ئازادی دەکات، خودی خۆی پیادەی ناکات و.. ئەو ژنەشی پیادەی دەکات، قسە ناکات.. تۆ دەلێیت، ئەز داکۆکی[12] لە ژن، بەشێوەیەکی رەها، دەکەم.. ئەو رەهاییە چییە باسی لێوە دەکەیت؟..

---

[12] واتا نزار قەببانی– وەرگێر.

ئایا پیت وایە ئەو کتیبەم (ڕۆژانەی ژنیکی بێ موبالات) قسەکردنیکی ڕەهایە لە بارەی ئازادییەوە..!

هەموو دنیا پیم دەلیت کە واقعیەتی من هەتا رادەی مردن واقعیەتیکی بریندارەو.. ئەو شاعیرەم خەون پلاو نیم و.. لە وەهمدا ناژیم..

لیرەوە، ئایا دەکرێ ئەوەت لی بخوازم کە جاریکی تر بمخوینیتەوە..

سەبارەت بە مەسەلەی چینایەتیش، لەو بروایەدا نیم کە چینایەتی مایەو بنەمای کلۆلیی و میحنەتباریی ژنی عەرەب بیت، چونکە ئەو زولمەی لە ژن دەکریت لە هەموو جیگایەکی نیشتماندا هەر یەك زولمە.. چەندین شازادە هەن، ئەو گەمارۆ ترسناکەی پیاو خستوویەتیە سەر بیرکردنەوەو هەلس و کەوت و خویندنەوەیان، هیچ شۆفیریکی تاکسی یان کریکاریکی ئاسایی ئەو گەمارۆیە بەسەر کچەکەیدا ناسەپینیت.. ئەوەی من سەرنجم دابیت ئەوەیە؛ رژیمە عەرەبیەکان، بەراسترەو و چەپرەویانەوە، هیچیان لە هەلویستی میژوویی و کلاسیکی خۆیان بەرامبەر ژن نەگۆریوە.. لیرەشەوە، سەرجەمی ئەو دروشمانەی کە بانگەشەی ئازادیی ژن دەکەن و ئەو رژیمانە بەریان کردۆتەوە، جگە لەوەی چەند دیکۆریکی شۆرشگیرانەن، چیی تر نین..

٢٤

***تۆ وتووتە:**

**"ئازیزەکەم، وای لەم نیشتمانەی کە دەترسیت لەوەی جەستەی خۆی لە ئاوینەدا ببینیت، نەبادا ئیشتیهای بکات.. دەشترسیت لەوەی لە تەلەفۆندا گوێ بیستی دەنگی ئافرەتیك بیت، نەبادا دەستنویژەکەی بشکیت.."**.

لەم قسەیەدا، وەك بە ئاشکرا دیارە، جۆریك لە رەمزییەتی راستەوخۆ هەیە کە ئاماژە بۆ ناجۆرییەکانی واقیعی ئیمە دەکات.. پرسیار ئەوەیە؛ بۆچی (ژن)ت لەم لایەنەوە، کە لایەنیکی سیاسییە، بەکارهیناوە؟

–گیا لەسەر زمانم شین بوو[13] ئەوەندەم لە نووسینەکانمدا دووپات کردەوە کە لای من، ژن (پلاج)یکی سەر دەریا نییە تاکو لەسەر لمە ئالتوونییەکەی راکشیم.. بەلکو ئەو زەوییە شۆرشگیرەیە کە شۆرش و کۆدیتاکانمی تیدا تاقی دەکەمەوە.. بەڵام چبکەم ئەو (شالە سوورەی) بە شانمەوەیە، رێ بەخەلك نادات بروام پیبکەن.. هاوسەرەکەم هەمیشە پیم دەلیت ئەو شیعری خۆشەیستییەی ئەز دەینووسم، شیعریکی

---

[13] کورد دەلیت: زمانم سوا– وەرگیر.

سیاسییه.. سەرەتا قەناعەتم بەو راڤەکردن و شییکردنەوەیەی هاوسەرەکەم نەبوو، تاکو تۆ ئەم پرسیارەت وروژاند کە پالپشتی بۆچوونەکەی ئەو دەکات..

دواتر بەرەبەرە، قەناعەتم بەوە پەیداکرد کە هەموو شتێک لە ژیانی ئیمەدا بۆتە سیاسەت.. لەوانەش خۆشەویستی و ئەو پەیوەندییە سۆزدارییانەی کە بە ژنەوە هەمانە..

لەمرۆکەدا، ئاسان نییە لە ژوانی دلدارەکەتدا فنجانێک قاوە بخۆیتەوە بێ ئەوەی جەستەی بەیرووت یان بۆمبی نیوترۆن نەکەویتە سەر رووی فنجانەکەت..

بە وشەیەکی رونتر، تازە بۆمان نالویت عیشقبازی لەگەڵ ژنیکدا بەبێ دەم بردن بۆ موفرەداتی سیاسی، بکەین..

سنورەکانی نیوان گوڵ و بۆمبا، نیوان گۆرانیی خۆشەویستی و بەیاننامەیەکی سیاسی، لە هیکرا هەلوەشاونەتەوە..



* پەیوەندی نیوان شەکلی فیزیۆلۆژی دەرەوەی شاعیرو، شەکلی قەسیدەکانی چییەو.. سەبارەت بە خودی خۆشت؛ ئایا لەو بروایەدایت کە شەکلی دەرەوەی جەستەت رۆلی هەبووە لە بە جەماوەرییوونی شیعرەکانت و تامەزرۆیی خەلك بۆ گویگرتن لیت؟ ئەو ئاماژەیە کامەیە کە بە شیعرەکانتی ئەدەیت و.. ئەو ئاماژەیەش چییە کە ئەیدەیتە شەکلی خۆت..؟

–ئەمە پرسیاریکە، بەدیی‌و زەکاوەت و ئاژاوەی تیدایە.. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا بە هیمنیی و بابەتییانە وەلامی ئەدەمەوە..

لەهەر دەولەتیکدا، کاتیك وەزارەتی دەرەوەی ئەو دەولەتە، ئاگادارییەك لە بارەی وەرگرتن و هەلبژاردنی پۆستی دیپلۆماتەکانەوە بلاو دەکاتەوە، یەکەمین تاقیکردنەوە بۆ ئەوانەی داخوازیی خۆیان بۆ وەرگرتن لەو پۆستەدا پیشکەش دەکەن، تاقیکردنەوەی قەدو بالایانە..

کاتیکیش کۆمپانیایەك لە کۆمپانیاکان، یاخود بانکیك لە بانکەکان پیویستیان بە چەند پۆستیکی سکرتیری ژن هەیە، یەکەمین مەرج کە پیش مەرجی بەکارهینانی خیراو کورتبرییانەی ئامیری چاپکردنە، مەرجی شەنگ و شۆخییە..

ئەگەر مەرجی شەنگ و شۆخیی و قەدوبالای جوان، مەرجیکی داواکراو بیت لە پۆستەکانی بالیۆزو ژنە سکرتیرو میوان بەریخەری نیو فرۆکەو هەر بواریکی تری بوارەکانی پەیوەندییە گشتیەکان، ئەی بۆچی ئەو شەنگیی و بەژن جوانییە سەبارەت بە شاعیر نەبیتە هۆکاریکی گرنگ لە هۆکارەکانی سەرکەوتن و دەرکەوتنی..

کەواتە: هەرکەسیك کە پەیامی بانگەشەی خەلك بۆ هەر مەبەستیکی مرۆیی دەگریتە ئەستۆ، وەك مژدەبەرو، پیغەمبەرو، وتاربیژو، پیاوی ئایینیی‌و، مامۆستاو، سەرکردە

سیاسییەکان.. مەرجە لانی کەمی شەنگی‌ی جەستەیان تیدا بیت.. چونکە چاو[14] سەرەتای ریگەیە بۆ قەناعەت پیکردن..

ئەگەریش بشیت تەعبیریکی تەکنەلۆژیی بەکاربهینم، ئەوا دەلیم، شاعیری ئەمرۆ، بە تەنها ئەوەی بەس نییە کە بەتەنها، دەنگ بیت.. بەلکو پیویستە بە دەنگ و رەنگەوە بچیتە مالی خەلکەوە..

٢٦

*خەسلەتەکانی ئەو ژنەی ( خۆشت دەوێ ) چین..؟

-من وابەستە نیم بەو سیفەت و خەسلەتە نیو دەولەتیانەی کە لە هەلبژاردنی شاجوانی دنیادا رەچاو دەکرین.

دەشیت بە دیداری ڤینۆس بگەم.. بەلام خۆشم نەویت و.. بەدیداری ئەفرۆدیت بگەم و.. بەلام خۆشم نەویت. دەشیت بە دیداری هەریەك لە عەشتەروت.. یان ئیزیس.. یاخود نەفەرتیتی بگەم.. بەلام شتاقیانم خۆش نەویت..

کاتیك ملیۆنان کەس بە میوانیی دەچنە سەردانی مۆزەخانەی لۆڤەرو لە بەردەم زەردەخەنەکەی (مۆنالیزا)دا تووشی تیرامان و سەرسورمان دەبن، کەچی ئەو زەردەخەنەیە

---

[14] بینین- وەرگیر.

لـــەلای مـــن زەردەخەنەیـــەکی ســـاردو ســـرەو، بگـــرە وەك زەردەخەنەیـەکی دروسـتکراو هاتۆتـە بـەرچاوم و، زیـاتر لــە هـی پیاوان دەچیت.. (تەنانەت هەیە دەلیت ئەو نموونەیەی کە لیۆنـاردۆ دافنشـی ئـەم زەردەخەنەیـەی لی وەرگرتـووە کـچ نەبووە، بەلکو کوریکی گەنج بووە..).

شـاجوانەکان ناچنـە بازنــەی خواســت و بایــەخ پیدانــی منەوە، بەلکو من بەدووی ژنیکدا دەگـەریم لـە ئـەهلی رەعیـەت کـە ببیتـە خۆشەویسـت و شـاژنم.. ژنیـك.. ئـەز بـە بســت و سانتیمەتر ناپییوم، بەلکو بەو سووتان و تەقینەوانە دەیپییوم کە دەشیت لەهـەر چرکەیـەك لـە چرکـەکانی ژیـانمدا بـەرپایان بکـات.. ئــەو ژنــە کییــە؟ لــە کوییــە؟ لــەکام ئەسـتیرەوە دیتــە خـواریێ؟ بـەکام فرۆکـە دەگـات؟ لـە چ ئوتیلیــك دادەبــەزیت؟ بەسـەر کـام شۆسـتەدا ریێ دەکـات؟ لـە چ دەرگایەکـەوە دیتـە ژوریێو.. چەند چامەی شیعریی لەسەر کاغەزو پـەرەکانم جیێ دەهیلیـت؟.. راچیتـەی میینـەتیی، راچیتەیـەکی زۆر نهینییـەو لای عەتارو ئەجزاچییەکان دەست ناکەویت.. بەلکو بەتەنیێ لە برژانگـی ژنـان و لـەناو کتیبـەکانی شـیعردایە.. هـەر ژنیــك، تایبەتمەندیتی خۆی بە خۆیەوەیـەتی، وەك چۆن هـەور ئـاوی خۆی لەگەڵ خۆیداو، ئەستیرەش رۆشـنایی خـۆیو، قەسـیدە مۆســیقای خــۆی و، چــاوی بــەکل ریژراویــش کلەکــەی بــە خۆیەوەیـــەتی. کەوتنـــە داوی خۆشەویســـتی، حالـــەتیکی تایبەتە، حالەتیکە بە هەورو تەم و مژ گەمارۆ دراوە.. پیاویك

نییه بەو روونیی و ئاسانییه بتوانیت پیت بلیت خوینەکەی چۆن و لەسەر دەستی کام ئافرەتدا رژاوە..

ژنیکیش نییه بتوانیت شەرحی ئەوەت بۆ بکات چۆن ئاگر بەربۆتە کراسەکەی و[15] ئەو پیاوە کییە ئەمی کردۆتە خۆلەمیش.. دواجار ئەوانە راست دەکەن کە خۆشەویستی دەبەستنەوە بە قەزاو قەدەرەوە، چونکە کەوتنە داوی خۆشەویستی ناچیتە ناو چوارچیوەی بەرنامەریژیی و پلان دانانەوە.

دەشیت ژن، هەتاکو لە ژیاندایەو تا ئەو کاتەشی دەمریت، ئەو پیاوەی دەست نەکەویت کە خۆی بەشوینیا دەگەریت..

دەشیت پیاو لە ژنیکەوە، هەوار بۆ ژنی دووەم و.. دەیەمیش بگویزیتەوە، بەلام هەرگیز ئەو ژنە راستەقینەیە نەدۆزیتەوە کە لەوەتەی خولقاوە، چاوەریی دەکات.. ئەمیستا، نۆرەی منە بپرسم: کەی بەو ژنە دەگەم کە (لە ئاییندەدا خۆشم دەویت)؟ ئەو ژنە کییە کە دەمکاتە دە ملیۆن پارچەوە؟ لەکام گازینۆ لە گازیۆکانی دنیادا چاوەریمە؟ چیی لەبەر دەکات؟ چۆن قسە دەکات؟ چۆن چۆنی بیر دەکاتەوە؟..

ئەمانە پرسیارگەلیکن، هیی ئەوە نین بکرین..

---

[15] لە کوردەواری خۆماندا دەوتریت ئاگر بەربۆتە خەرمانی– وەرگیر.

خۆشەویستیی، لە زۆر شتدا سروشتی بومەلەرزەی هەیەو..

کیش دەتوانیت پرسیار لە بومەلەرزە بکات؟؟..

٢٧

***ئەو خۆشەویستییەی تۆی پێی ناسراویت و، ئەویش بە تۆ ناسراوە.. ئایا حالەتیکی جیگیرە، یاخود لە جوولەدایە؟**

-خۆشەویستی‌ی مەزن، دژی جیگیربوون و بە بەرد بوونە..

ئەو شەپۆلەیە دەمانباتە ئاسمانی حەوتەم و، لەویشەوە فریمان ئەداتە حەوتەمین چینی زەوی.. خۆشەویستی‌ی مەزن، ئەو دەریایەیە، کەنارەکانی دیار نین.. ئەوانەشی لەو دەریای خۆشەویستییەدا بۆ دورگەیەك یان پارچە تەختەیەك دەگەڕین تا لەسەری بگیرسینەوە، چاکتر وایە سەفەر بەو دەریایەیەدا نەکەن..

خۆشەویستی، بریتییە لەوەی هەمیشە سواری ئەسپی دەهشەت ببین و.. لەو ئاوەدا مەلە بکەین، کە بە هۆی زریانی هەلکردووی دەریاوە، مەلەکردنیان تیدا قەدەغەکردوون.. ئەو کاتەشی خۆشەویستیی دەچیتە چوارچیوەی عاداتی رۆژانەوە، ئەوسا دەبیتە وەزیفەیەك وەك سەرجەم وەزیفە حکومییەکانی ترو، بگرە دەبیتە دەزگایەك (مؤسسة)یەك

بۆخۆی.. هەرکاتیکیش وەك دەزگای لیٰهات، ئەوکات خۆی، خۆی دەکوژیت..

ئەز، سوورم لەسەر ئەوەی خۆشەویستییەکەم بەردەوام وەك بروسکە وابیت و هەموو شتەکان لە چرکەیەکدا رۆشن بکاتەوەو پاشان لەچاو ون ببیت.. هەروەها سوورم لەسەر ئەوەی کە روخساری خۆشەویستەکەم لەو دەڤەرەدا کە دەکەویتە نیوان رۆشنایی و تاریکییەوە، بمینیتەوەو.. سووریشم لەسەر ئەوەی ژمارەی ئەو پرسیارانەی کە لە بارەی خۆشەویستییەوە دەیان وروژینم پرسیارگەلیکی زۆتر بن لەو وەلامانەی کە دەستم دەکەون..!

٢٨

***ئەمیستاکە، خۆشەویستی چۆن دەکەیت؟**

–کتیبیك نییە، ناوی کتیبی فیربوونی هونەری عیشق بیت، بە چەشنی ئەو کتیبانەی کە بۆ فیربوونی ئاژوشتنی ئوتومبیل نووسراون..

ئەگەر کتیبی لەو جۆرە هەبوایە، ئەوا سەرجەم ژنان و پیاوان لە هونەری عیشقدا دەبوونە (دکتۆر).. ئەوەی ئەز وینای دەکەم ئەوەیە؛ خۆشەویستیی، خۆی، خۆی فیردەکات وەك چۆن چۆلەکە بیٰئەوەی بچیتە قوتابخانەی فرینەوە،

خۆی فـیره فریـن دەبیــت و، ماســییش بــێ ئــەوەی بچیتــە قوتابخانــەی هــیزی دەریاییـــەوە، خــۆی فــیری مەلــەکردن دەبیت..

دەپرسیت: "ئەمیستاکە، چۆن خۆشەویستیی دەکەم؟"

هـەرگیز بیرم لـەم مەسـەلەیە نەکردۆتـەوە.. ئـەوەی بیـەوێ شت بکات هەر دەیکات و بیری لێ ناکاتەوە..

بلێی هەور بزانیت چۆن دەباریت؟

درەختیش بزانێ چۆن گوڵ دەکات و..

سیو بزانیت چۆن بەر دەبیتەوە؟

منیــش نــازانم چــۆن خۆشەویســتی خــۆی بــەدلمدا دەکـات و.. بـۆ رۆژی دواییـش، چـۆن وەك کۆتریکـی ســپی، ئەداتە شەقەی باڵ..

٢٩

*پاش سی ساڵ لە موعاناتی خۆشەویستی، بەهەموو تــالیی و شیرینیی، سووتـان و غەرقبوونیکەوە.؟. بەرئە نجامەکەی چیی بوو؟

–هیـچ.. جگـە لـە بیسـت دیوانـە شـیعرو.. تووشـبوون بـە داخرانی خوینبەریکی دڵ و.. ئەو بەلینـەی کـە بۆ تۆبـەکردن لەخۆشەویستی دام و، دواییش بەجیم نەهینا..

٣٠

***بەڵام ئەوە نرخیکی ( بەهایەکی ) گرانــە کـە تــۆ دەییەخشیتە خۆشەویستی و شیعر؟**

–هەموو شتە مەزنەکان، بەهایان بەزرو گرانە..

٣١

***باسی خۆشەویستی و زەمەنم بۆ بکە.. ئایا یەك ئەوی تریــان دەکوژێت؟**

ئایا زەمەن چ گۆرانکارییەکی لە دیدو بۆچوونتدا بەرامبەر ئافرەت، بەرپاکردووە؟

–نە من لە جیگەی خۆمدا چەق دەبەستم و، نە ژنیش لە جیگەی خۆیداو، نەگۆی زەویش لەجێی خۆیاندا چەق دەبەستن.. لەهەر خولەکیکدا گۆرانکاریی ترسناك لە کۆئەندامی میشکی ئیمە دا روو ئەدات.. دەیان ملیۆن شانە (خلایا) لە دەماخماندا دەمرن و، دەیان ملیۆن شانەی تر دروست دەبن.. پینج هەستەکەشمان، ئەوانیش دووچاری چەندین پەرەسەندنی وا دەبن کە ناتوانن شییان بکەینەوە.

ئەو ژنەی، کە ماوەی بیست سالە ئیمە دەمانەویت خۆمان لە پیناویدا بکوژین.. ئیستاکە وا دیتە بەرچاومان کە هەمان ئەو ژنە، تابلۆیەکی زەیتییەو، تیشکی خۆرو تەپ و تۆز

کردوویانەتە پیخۆری خۆیان.. ئەی چی بەسەر ئیمەدا دێ؟ ئەوەی بەسەر ئیمەدا دیت، هەمان ئەوەیە کە بەسەر زەوییدا دیت ئەوکاتەی لە مانگی نیساندا دەبیتەوە هەرزەکاریك و حەماس دایدەگریت و، هەلدەچیت و، سەما دەکات و.. بەپیی پەتی بە دارستانەکاندا رادەکات و.. بە تریفەی مانگ خۆی دەشوات.. هەتا ئەو دەمەی زستان دیت و،ئەویش پەنجەرەکان کلۆم ئەدات و بە پەتۆیەکی خوری خۆی دادەپۆشیت و دەست دەکات بە خویندنەوەی ئەو کتیبانەی کە لە بیری کردبوو لە وەرزی بەهاردا بیانخوینیتەوە..

خودی خۆشەویستی، وەك گەوهەر، ناگۆریت.. بەلاّم ئەوەی دەگۆریت، شیوازو هەلوسیتەکان و، چۆنیتی مامەلەکردنە..

ئەو کەسە دەشتەکییەی، خۆشەویستەکەی خۆی بە باوەش بەرزدەکاتەوە بۆ ئەوەی یارمەتیی بدات لە سواربوونی وشتردا، لە بنەرەتدا چ جیاوازییەکی لەگەلّ ئەو کەسە ئەوروپاییەدا نییە کە دەرگای ئۆتۆمبیلیکی کادیلاك بۆ خۆشەویستەکەی دەکاتەوە تا یارمەتی بدات بۆ ئەوەی سەرکەویتە ناویەوە.

ئەو پیاوە دەشتەکییەی، کارمامزیکی لە جەنگەلیکدا راوکردووەو، بەدیاری بۆ خۆشەویستەکەی دەباتەوە، لە رووی نیازپاکییەوە چ جیاوازییەکی لەگەلّ عاشقیکی سەدەی بیستەمدا نییە کە چەپکێ گولە یاسەمین دەکاتە دیاریی بۆ خۆشەویستەکەی..

***تۆ دەلییت خۆشەویستی مەلەکردنە بە پیچەوانەی تەوژمەوە، ئایا دەکریت هەمان ئەو حالەتە بەسەر فکریشدا پیادەبکریت؟ بەجۆریکی تر، ئایا ئەوەش لە چارەی فکر نووسراوە کە هەمیشە لە پیکدادانا بیت لەگەڵ کەسەکان و شتەکانی دەوروبەری خۆیدا؟**

–سروشتی داهینان، سروشتیکی کۆدیتاییە..

کاری داهینەرانەش، شیعر بیت، یان رۆمان، یاخود شانۆ.. یا هونەری شیوەکاری بیت، هەمیشە هەولی سرینەوەی فۆرم و بیرۆکەو قەناعەتە کۆنەکان و، هاوکات دامەزراندنی فۆرم و بیرۆکەو قەناعەتی نویٚ ئەدات.. لەهەر کاریکی داهینەرانەدا، پیویستەو هەر دەبیت شتیک بشکینریت، یان شتیك (ئیغتصاب) بکریت، یان شتیك لە شوینی خۆی بترازینریت.. لەم بارەدا ئەو شتانەی دەشکینرین و ئیغتصاب دەکرین و لە شوینی خۆیان دەترازینرین، چاریان نییە یاخود بە ناچاریی و بەپیٚی یاسای داکۆکی لەخۆکردن، مردنی خۆیان رەت بکەنەوە.. ئەمەیە ئەو پیکدادانە کۆن و میژووییەی کە لە نیوان چەکوش و بەرد.. نیوان خەنجەرو زام.. نیوان پریشکی ئاگرو گۆشتی ئادەمیزاددا روو ئەدات..

لـيرەوە، پيويسـتـە نووسـەر، وەك پلنگـى نـاو جەنگـەڵ هەميشە لە حالـەتى مراندن و، هـەژان و، توورەبووندا بيت.. لـەو چركەيەشـەوە كـە نووسـەر دەبيتـە دەسـتـەمۆى ئـەو بارودۆخەى تيايدا دەژى و، پىٚى راديت و، بارودخەكەش بەو رادين.. ئيتر لەو چركەيەوە، نووسەر دەبيتە ئاژەليكى ماليى و پلنگيكى كاغەزين..

٣٣

*لـە شـيعرى تـۆدا، ژن ئامـادەبوونيكى لـە رادەبـەدەرو قۆرخكارانەى هەيە، بەتـايبەتى لـە شيعرەكانى سـەرەتـاتدا؛ لـەو شيعرانەتدا دەبينين ژن لەو رووبارە دەچيـت كـە لـە نيـوان حـەرف و نوختەو فاريزەكاندا، هەروەك لە مالى خۆيدا بيت، راكشـاوە.. ئـەو پەيوەندييە جەدەلييەى نيوان ژن و شيعر چييە؟

–ژن خۆى شيعرە..

نـەك پاشـكۆ، يـان پاشـپرتك (مضـاف اليـە).. يـاخو پـەراويزيك بيت لـە پـەراويزەكانى شـيعر.. هـەر شـيعريك كـە نووسـرابيت، يـان ئيسـتا بنووسـريت، يـاخود لـە ئـايندەدا بنووسـريت، پەيوەسـتيى بـە ژنـەوە وەك پەيوەسـتيى نيـوان كۆرپەلەو ناووكەپەتى ويلداشـەكەى.. هـەر هـەولدانيكيش بۆ

لیکـــترازاندنی ئـــەو دوانـــە، لەیـــەك كـــاتدا مندالەكـــەو دایكەكەش دەكوژیت..

ژن، شیربەخش و دایەن و میینەی شیعرە.. وەكی تریش ژن، نیرینەیی و كەلیتی‌ی شیعر دەسەلمینیت..

بەبێ ژن، شیعر ناتوانیت گەورە بیت و.. گەشەبكات و.. لەسەر پییەكانی خۆی رابوەستیت.. ژنیش، ئەگەر شیعر نەبیتە هاورێ و خۆشەویستی، ناتوانیت سیحر و قەشەنگیی خۆی بنوینیت و جیهانیش بكاتە چۆلەكەیەكی شین و گەمەی پیبكات..

كەواتە، ژن و شیعر تەواوكەری یەكترین..

ژن، داگیرسان و، گەشانەوەو.. كەرەسەی خاو دەبەخشیتە داهینانی شیعریی و.. شیعریش، ژن دەرازینیتەوەو، چاوانی دەریژیت و، عەترپرژینی دەكات و لە نەمان و پووكانەوە دەیپاریزیت..

ژن، بوونیكی ئاویی بە شیعری من بەخشیوەو.. تەپ و تۆزی بیابانی لە ئەبجەدییەتی شیعرم تەكاندووە..

ئەز، بەتەنێ لە شیعری خۆشەویستی نادویم.. بەلكو لە هەرچیەكی نووسیومە، بە شیعرو پەخشانەوە، ئەدویم..

ژن، چەشنی گەوالە هەوریك بە شوینمەوەیەو، تەنانەت شیعرە نەتەوایەتی و سیاسییەكانیشم سایەباران دەكات..

***کەواتـە.. بۆچـی (عبـاس محمـود العقــاد) وتویــەتی: نــزار قەببانی چۆتە سـەرا پەردەی ژنـەوەو، ئیـتر لیـی نەهاتۆتـە دەرێ.. بلـێی ئەمــە گلەییــەکی ئەدەبییانــە بیــت.. یــاخود نوکتەیــەکی میسرییانەیە؟**

—نە ئەمیانەو.. نە ئەویشیان..

ئــەوەی (العقــاد) وتویــەتی، رەنگدانــەوەی دووفــاقیی رووناکبیرانی عەرەبە.. چونکە رووناکبیری عەرەب، هەرچەندە ئاسۆی بیرکردنەوەی فراوان بیت و، سەرچاوەکانی مەعریفەو خویندنەوەو تاقیکردنەوەکانی زۆر بن، کەچی هیشتا گرێی جنس لە ناخیدا بە شاراوەیی دەمینیتـەوەو.. ژنیش لـەلای، سەرچاوەیەکە لە سەرچاوەکانی شەرم و شوورەیی..

ئەوەی لـە (العقاد)دا دووچاری تیرامانم دەکات ئەوەیــە، ئــەو نــە لــەرووی عاتیفیــەوە بیبــەش بــووەو نــە کەسـیکی گرفتاریش بووە لەو بارەیـەوە، خۆ پەیوەندییەکانی خۆی بە (مي زيادە) و (سارە)وە، پەیوەندیی نهینیـی نەبوون..

ئـەز خـودی خـۆم، لـەو بارەیــەوە خۆشـنوودم بـەوەی کـە کەســیکی وەك (العقــاد) توانیویــەتی لـــە ســـەرەتای ئـــەم سەدەیەدا، پەیوەندیی لەگەڵ ژناندا بگریت، لە کاتیکدا و لەو رۆژگارەدا کۆمـەلی میسری بـەچاوی لیبووردنـەوە لـەو جـۆرە پەیوەندیانـەی نـەدەروانی..! بـەڵام دووفاقیی رووناکبیران کـە پیشـتر ئامـاژەم بـۆ کـرد، وای لـە (العقـاد) کـردووە رەخنــەم

لیبگریت و عەیبدارم بکات بەوەی (چوومەتە سەراپەردەی ژنەوەو لیی نەهاتوومەتە دەرەوە)، لە کاتیکدا خۆی زیاتر لە جاریك سالۆنە (ئەدەبیەکەی) -مي زیادە-وە.. کە شەوانیش مالی ئەو خانمەی جێ دەهیشت کەس لە نهینیی ئەو سەردانە پیچانەوەوە پرسیاری لێ نەدەکرد، ئایا ئەوە بەهۆی عیشقی ئەدەبەوەیە.. یاخود عیشقی ئەو خانمە لوبنانییە زیرەك و نیگا بەخشە بوو کە لەو سەردەم و رۆژگارەی میسردا، زۆربەی پیاوانی ئەهلی ئەدەبی کەمەندکیش دەکرد..

رەنگە ویژدان و ئینساف ئەوەم لێ بخوازن کە هەلویستی مامۆستا (توفیق الحکیم) سەبارەت بە شیعرم لە سالانی چلەکاندا، تۆمار بکەم..

ئەوکاتەی کۆمەلە شیعری (مندالیتیی مەمك)م لە قاهیرە بلاوکردەوە، هەلویستی (الحکیم) لە هەردوو رووی هونەریی شارستانییەوە لە هەلویستی (العقاد)ی مامۆستامان لە پیشتر بوو..

مامۆستا (الحکیم) زمانیکی تازەی شیعریی لە (مندالیتیی مەمك)دا بەدیی کردو، شیوازیکی نوێی دەربرینو، پەیڤینیکی جیا لە رستەی شیعریی باو و ئاسایی تیدا دۆزییەوە.. (الحکیم) لە هەمان گۆشەنیگای (العقاد)ەوە قسەی لەسەر شیعرەکانم نەدەکرد، چونکە ریبازی هونەریی

(الحكيــم) لـــه رووی تازەگـــەریی و کراوەیـــی و پێشـــکەوتن خوازییەوە زیاتر لە پێشەوە بوو..

٣٥

***چل ساڵە تۆ دەوامی ڕێك و پێکی خۆت لە قوتابخانەی ( ژن )دا دەکەیت.. قۆناغەکانی سەرەتایی و سانەوی و زانکۆت بڕیوە..١٦ دەکرێ پێمان بڵێیت بەری ڕەنجی سەختی ئەم خوێندنەت چییەو.. چیی لە ژن فێربوویت؟**

–چ شتێك فێر نەبووم..

چونکە خۆشەویستیی تاقە زانستێکە، هەتا مەڵەی تێدا بکەیت، جەهلت زیاتر دەبێت..

لـە دنیـای (ژن)دا، بڕوانامـەی بـاڵا نییـەو.. لـە هـەموو جیهانیشدا پیاوێك نییە، وێڕای کۆشـش و سـەعی کردنـی، بتوانێت بانگەشەی ئەوە بکات کە بڕوانامەی (دکتۆرا)ی لە خۆشەویستیدا هێناوە.. یەك بەخۆم بڕوانامەکان نابنە مایەی بایـەخپێدانم.. بـەڵکو بـە پێچەوانـەوە، ئـەز بـە ئەنقەسـت تەمبەڵیی دەکەم بۆ ئەوەی دەرنەچم و.. نیو سەدەی تریش لە قوتابخانەی (ژن)دا بمێنمەوە..

---

[16] لە سیستمی پەروەردەیی و خوێندنی هەردوو وڵاتی سوریاو لوبناندا، بەهەردوو قۆناغی ناوەندی و ئامادەیی دەوترێت: سانەوی– وەرگێر.

ئەز هەرگیز پەلەی دەرچوون (التخرج)م نییە..

چونکە گەر لە قوتابخانەی ژن دەرچووم، ئەوسا دەبمە کەسیکی بیکارو.. بەدەم قەهرەوە دەمرم..

پیاوی زیرەك، ئەو پیاوەیە کە هەتا خوا حەز بکات و مەیلی لەسەر بیت، وەك (قوتابییەك) لەگەڵ ژندا بمینیتەوە..

ئەو لەحزەیەش تیایدا پیاو بانگەشەی ئەوە دەکات کە خەتمی دەرسەکانی کردووەو، ئیتر بۆتە داناو، زانا.. یاخود بۆتە (مەرجەعیك) بۆ شارەزایی لە کاروباری ژناندا.. ئەوکات چیژی گەران و پەیپیبردن ون دەکات و لە ریگەی نامەگۆرینەوەوە (المراسلە) دەبیتە ئەندامی یەکیك لە کۆرەکانی زانیاری (المجامیع العلمیە).

بۆیە، بەختەوەرم کە ئەوە رابگەیەنم؛ ئەز لەگەڵ ژندا، لە هەموو پلەکانی خویندنما راسب بووم و.. رەنگە ئەمەش تاقە ریگە بیت بۆ ئەوەی وەك شاعیریك بمینمەوە..

٣٦

*عەتر چیت پێ دەلیت؟

–عەتر؛ ئەو زمانەیە، وەك هەموو زمانەکانی تر، وشەو، حەرف و، ئەبجەدییەتی خۆی هەیە..

عەترەکانیش، جۆرو تیکەلەی خۆیان هەیە..

هەیانە، یەکپارچە نزایە..

هەشیانە، یەکپارچە نویژکردنەو..

تیاشیاندا هەیە، یەکپارچە داگیرکردنیکی بەربەرییانەیە..

عـەتری شارسـتانیی، جوانیـــی خـۆی هەیـەو، هـەروەها عەتری کیویش جوانیی خۆی هەیە.. دیارە پیوانـەی ئەمـەش بەپیّی ئەو بارە دەروونیەیە کە تیایدا پیشوازیی لـە عـەتر دەکـەین و.. هـەروەها جـۆری ئـەو ژنـەی خـۆی عـەترباران دەکات..

پیاویش، گەمەی خۆی، لە هەلسەنگاندنی عەتردا دەکات، بە واتا لووتی پیاو لەکاتی بۆنکردندا پەیوەندیی بە ئاست و شارسـتانیتیی پیاوەکـەوە هەیـە.. پیـاوانی وا هـەن ئـەو عەترانەیان خۆش دەویت کە هاوار دەکەن و.. پیاوانیش هەن ئەو عەترانە بە چاك دەزانن کە گیان دەکوژن..

پاشان، جۆری پەیوەندییەکەمان بە ژنـەوە، رۆلـی خـۆی هەیـــە لـــە دیـــاریکردنی جـــۆری ئـــەو عـــەترەی سەرنجمان رادەکیشیت..

عەتری یار شتیکەو.. هیی عەشیقە شتیکی ترو.. عـەتری کچە قوتابییەکی تەمەن حەڤدە سالّ شتیکەو.. هیی خانمیکی تەمەن چل سالّ شتیکی تر.. سەبارەت بـە منیـش، بـەپیّی گۆرانـی باری دەروونیم، جۆری ئەو عـەترەش دەگۆریـت کـە هەلی دەبژیرم؛ هەندیك جار ئەو عەترەم خۆش دەویت کە بە نەرم و نیانیی دەستم پیادەهینیت و.. هـەندیّ جاری تریش

ئـەو عـەترەم خـۆش دەویـت کـە شۆرشـم بەسـەردا بـەرپا دەکات و.. جاری واش هەیە ئەو عەترەم لا خۆشەویستە کە دەکەویتە دایالۆگیکی دریـژەوە لەگـەلمدا.. بـەلام ئـەو ژنـەی میشکم دادەگیرسینیت، ئەو ژنەیە کـە چەشـنی هـەور دیتـە لام و، جگە لە چەند دلۆپیك ئاو هیچی تری لەسەر پیستەکەی هەلنەگرتووە..

٣٧

***لـە هـەموو نووسینەکانتدا، پـێ لەسـەر ئـەوە دائـەگریت کـە پیویستە خەسلەتی عاشقانە لە سەرکردەی عەرەبیدا هەبیت.. ئایـا لە رووی سیاسییەوە ئەمە شتیکی شیاوە؟**

-ئەگـەر سیاسـەت ئـەوەبیت کـە ماکیـاڤیلی نەخشـی کیشـاوەو پراکتـیزەی کـردووە، ئـەوا، نـەخیر ئـەوە کـاریکی شیاو نییە..

بـەلام ئەگـەر سیاسـەت ئـەوە بیـت کـە (عومـەری کـوری خەتتاب) چ وەك فیکرو چ وەك کردەوەش تیایدا ژیاوە، ئەوا، ئەوە کاریکی زۆر شیاوەو.. زۆریش ئاسانە..

ئەگەر گەلی عەرەب لە رووی فکرییەوە گرفتار بیت و، لە رووی نەتەوایـەتی و سیاسـی و دیموکراتیشـەوە موعانـاتی هـەبیت؛ ئـەوە هۆیەکـەی دەگەریتـەوە بۆ ئـەوەی کـە ئەوانـەی حوکمی دەکەن عاشق نین و.. ئەوانەش کە عاشقن، جلەوی حوکمییان بەدەستەوە نییە..

ئەوکاتەش حوکمرانیکی عاشق دیتە سەر تەخت، ئەوکات نـان دەبیتـە ئـالتوون و.. هــەژاران بــەرگی زیــر دەپۆشــن و، چاوانی منداڵان و.. قەسیدەی شاعیران دەبنە ئالتوون و.. ئەم نیشــتمانەش دەبیتــە ئــەو بەهەشــتەی کــە رووبارەکــان بەهەناویدا دەرۆن..

٣٨

***ئـایـا شـیعری تـۆ بـۆ یـەك ئـافرەت وتـراوە.. یـان زیـاتر لـە ئافرەتیك؟**

–ئەگـەر شـیعرم بۆ تەنـها یـەك ئـافرەت بوایـە، ئـەوا یـەك قەسیدەم دەنووسی و.. دواتر دەستم دەکیشایەوە.[١٧]

٣٩

***چ کاتیك هەست بەوە دەکەیت کە پیویستت بە سەرکۆنەکردنی خۆت هەیە؟**

–ئەوکاتــە ســەرکۆنەی خــۆم دەکــەم کــە لــە کــۆرو کۆبوونەوەیەکدا شیعر بخوینمەوە تیایدا پیاوان زیاتر بیر لە پیکە ویسکی بکەنەوە نەك شیعرو.. ژنانیش زیاتر بایەخ بە کلریژکردنی چاوانیان بدەن، نەك چاوانی قەسیدە..

[17] ئیستیقالەم دەکرد

٤٠

***رۆلی ژن چییە لە جیهاندا؟**

–رۆلی ژن ئەوەیە وا لە زەمین بکات بسوریتەوە..

٤١

***دەکریـــت بـــە دوو وشـــە تیـــۆری خۆتمـــان لـــە بـــارەی ئافرەتەوە پێ بلییت؟**

–رووانینی من بۆ ژن لە زیاتر لە هەزار قەسیدەدا پەرش و بـلاو بۆتــەوەو.. لــە ســەرجەمی کــەناڵ و شەپۆلەکانیشــەوە پەخشکراوە.. ئایا دەتەویت راڤەکردنت بۆ راڤە بکەم؟

٤٢

***( سعید عقل ) دەلیت کە تــەنیا یــەك گونــاهی لــە ئەســتۆدایە، ئەویش ئەوەیە ژنی خۆش دەویت..**

**ئەی تۆ، ژمارەی گوناهەکانی تۆ چەندن؟**

–دیـارە مەبەسـتت ژمـارەی چاکەکانمـە (فەزیلەتەکانمـە).. چونکە خۆشەویستی؛ تاقە کاری چاکەی ئیمەیە..

ئیـدی لـەوە بترازیت، سـەرجەمی کردارەکانمـان کۆمـەلیك گوناه و خراپەکارییین...

# شۆرشگەلیک
# لە زیندانی ژناندا
# لە "قاسم ئەمین"ەوە بۆ "نزار قەببانی"

**هەڤپەیڤینیك لەگەڵ "محی الدین صبحی"ی رەخنەگردا**

**١٥ ی تشرینی یەکەم (ئۆکتۆبەر)ی ١٩٨٠**

١

***محی الدین صبحی:**

*-بۆ ئەوەی بۆتی دەرخەم کە مەسەلەی ئازادکردنی ژن، مەسەلەیەکی چەندە ساختەیە، حەوالەی لای ژنانی رووناکبیرت دەکەم. تۆ وای نابینیت کە ژنە رووناکبیری عەرەب ئازادکردنی ژنی نەکردۆتە کیشەی خۆی؟ ریم بدە هیلە گشتییەکانی ئەو ریرەوەت بۆ بکیشم کە ژنی رووناکبیر لە ولاتی ئیمەدا، گرتویەتیە بەر:*

*ژنە رووناکبیری لای ئیمە، کاروانی خۆی لە ژیانی گشتیدا بە بلاوکردنەوەی پەخشانە شیعریك دەخاتە رێو، پاشان پیشکەوتن بەخۆوە دەبینێ و چەند کورتە چیرۆکیك، یان رۆمانیکی، لە قەوارەو بەهای هونەریدا، مامناوەند دەنووسیت و، دەشێ ژمارەیەك وتاریش بۆ کۆنگرەکانی ژنان و لە بارەیانەوە بنووسیت. خۆ ئەگەر پلەوپایەیەکی بەرزی بۆ خۆی بەدەست هیناو، میردیکی نایابیشی دەستکەوت، ئەوا ئەو دۆخەی بەردەوام دەبیت و، دواتریش دەبیتە خانمی هۆلەکان! ئەم حالەتانەش بە پانتایی کۆمەلی عەرەبی و، لەناو خاکی نیشتمان و تەنانەت لە مەنفاشدا، لەوە زۆرترن کە بینە ژماردن.. ئیتر بەدەر لەوە ئەگەر*

*حالـەتیك هــەبیت، ئــەوە حالــەتیكی نائاســایی (اســثناء) یــەو ریساکە دەسەلمینیت..*

***نزار قەببانی:**

-ئەگەر بمانەویت گوللە بە ژنانی رووناکبیرو (هەروەها پیاوانی رووناکبیریشەوە) بنیین، ئەوا گوللەکان هیچ کەسیك ناپیکن.. چونکە رووناکبیریی، بە مانا فراوانە ئاکادیمیەکەی، بریتییە لە شیوازی ژیان و.. هەلویستیکی نویٚ بەرامبەر بە جیهان و.. ئەو کەسەشی لەسەر رووباری ژیان دەوەستیت و بە تەنها خەریکی (تەماشکردن)ە بۆ ئەوەی بەدەم تەربوون.. یاخود غەرق بووەنەوە بمریت، ئەوە شایستەی ئەوە نییە وشەی (رووناکبیر)ی بەسەردا ببریٚ.

مشــکی نــاو کتیبخانــە، ئینســیکلۆپیدیایەکە (دائــرة المعارف) بۆ خۆی، رۆژانە دەیان کتیب لە فەلسەفەو ئەدەب و، میژوو و، بیرکاری و، زانستەکان موتالاٚ دەکات. سەرەراش هەرچییەکی لە بارەی مارکسیزم و، وجودییەت و، سوریالیزم و، تەکعیبیەت و، مۆدیرنیزم و، شیعری ئەلیکترۆنی بکەویتە بەردەست دەیخوینیتەوە..

کەچی سەرەرای هەموو ئەوەی کە (دەیزانیت)، هیشتاکە مەحکومە بە دۆخ و خەسلەتە (مشکایەتییەکەی) خۆی و ناتوانیت لەو دۆخ و خەسلەتە تیپەرینیت..

ئەم دووفاقییەی نیوان بیرۆکەو کردار.. نیوان تیۆرو پراکتیك.. نیوان خەونی ژنان بە کۆدیتاو هینانەدیی ئەو

خەونە، نیوان بیرکردنەوە لە تـیرۆرکردنی پیـاوو شـووکردن پیی، نیوان ریسواکردن و ئابرووبردنی پیاو بە خیانەت لـە رۆژداو کەچی چوونە باخەلی لە شەودا.. ئەم رووناکبیرییـە نیفاقزەدەییە.. یان نیفاقە رووناکبیرکراوە.. ئەمەیە بۆتە هۆی مانـەوەی ژن لـە ژیـر (چـەنگالی دەسـتی پیـاو)داو.. هـۆی بەزیندویتی مانەوەی شەهریار پاشا هەتا ئەمرۆکە..

کیشـەی ئـازادکردنی ژن، لافیتەیەکـە لـەو هـەزاران لافیتانەی کە جیهانی عەرەب دژ بە ئیستیعمارو، ئیمپریالیزم و، رەتـاندن و، دەسـەلات بەسـەرداگرتن و، سـەرکوتکردنی بەرزی کردوونەتەوە.. ئەوەی دەیکەین، خۆپیشاندان، یاخود ریپیوانیکە لەو ریپیوانانەی کە ماوەی چل سال دەبیت تیایدا ریَ دەکەین بیَ ئەوەی بزانین بۆچیو.. بەرەو کویَ ریَ دەکەین و.. بیَ ئەوەشی بتوانین بە تەنها یەك ژن لـە زیندانـی ژنـان بهینینـە دەرەوە.. هەرچییـەکیش لـە بـارەی ئـازادی و ئازادبوونـەوە وتـراوە، سـنوورەکانی زمـانی شـیعرییان نەبەزاندووە..

سـەبارەت بـە لایـەنی (مـەیدانی) کیشـەکەش، بیگومـان هەتاکو ئیستا، یەك کەس نە لە ژنان و، نە لە پیاوانیش لەو پیناوەدا خوینیان نەرژاوە..

کەواتـە، ئـەم شـەرە، شـەریکی کارتۆنییـە، شـەریکی دۆنکیشۆتانەو.. نمایشگەراییە..

ژن، ئەدەبی وەك جۆریکی تازەی (ماکیاژ) بەکارهیناوە بۆ ئەوەی بە سەداو سیماوە جارو ریکلام بۆ خۆی بکات و.. بە (کەسانی خاوەن مەبەست) رابگەیەنیت کە ئەم (لیرەدایە)و ئامادەیە بۆ شووکردن..

ریگەیشم بدە کە بەوپەری راشکاویی و تاکو رادەی بریندار کردن بلیم؛ هەندێ لە نموونەکانی ئەدەبی ئازادیخوازانەی ژنان لە جیهانی عەرەبیدا، لە (بانگەشەیەك بۆ شووکردن)، بانگەشەیەکی خۆرایی و بێ پارە، زیاتر نییە..

سەبارەت بە پیاویش، هەر کاتیك خۆپیشاندانی ژنان بەرپا بووبیت، ئەو بە چاویکی بەدو سووکەوە لە پەنجەرەی مالەکەیەوە سەیری خۆپیشاندانەکەی کردووەو، لەدڵ و دەروونی خۆشیا ئەوەی زانیوە کە ئەگەر لە بالکۆنی مالەکەیەوە قەسیدەیەکی خۆشەویستی ژنە خۆپیشاندەرەکان بخوینیتەوە، ئەوان لافیتەکانیان توور هەلئەدەن و ئەو سکالانامە پرۆتیستۆیانەی (عرائض الإحتجاج) پییانە لەت وپەتی دەکەن و.. بەگریان و پۆزشەوە بەردەبنەوە سەر سنگی.. یاخود خۆ بە مالەکەیدا دەکەن بۆ ئەوەی فنجانیك قاوەی بۆ دەم بکەن..

ئەو هیلی بەیانییەی کە لە پرسیارەکەتدا بۆ کاروانی ئەدەبیی ژنە نووسەری نیشتمانی عەرەبت کیشا، هەتا رادەی کارەسات، هیلیکی راست و دروستە..

ئەگــەریش بابەتیانــەو دوور لــە هــەر شــتیکی تــر، بـەدواداچوونمان هـەبیت بـۆ هەلـهاتن و، دواتـر ئـاوابوونی درەوشـاوەی ژنـان لـە ژیـانی رووناکبیریمـاندا لـە سـالأنی پەنجاکانـەوە هـەتا ئەمرۆکە، ئـەوا بۆمـان روون دەبیتـەوە کـە ئەدەب لەلای ئەوان لەوە بترازیت کە (ئوتومبیلیکی تاکسی) بـووەو گەیاندوونیەتـە بـەر دەرگـای دادگـای شـەرعی یـان بەردەرگای کەنیسە، هیچی تر نەبووە..

٢

*محی الدین صبحی:

سلوکی بەزیوانەی ژنانی رووناکبیر لـە هەمبـەر کیشـەکەیاندا ئەوکاتەی نووسەرو شاعیرانی پیاو هـەر لـە قاسم ئەمینـەوە تـاکو نزار قەببانی دەیخەنەروو، وای کردووە کیشەکەیان وەك کیشـەیەکی بـە زۆر دروسـتکراو بیتـە بـەرچاو.. تەنانـەت تـۆش کـە خـاوەنی زۆرترین جەمـاوەریت، لە مـەسەلەی وروژاندنی کیشەی ئـازادکردنی ژندا کە بە کیشەی خۆتی دەزانیت، هەست بە تـەنیایی دەکـەیت و جـەماوەری ئـەو ژنانەشـت بـە دەورەوە نییـە کــە دەتــەوێ بــەناوی ئەوانەوە قسە بکەیت.. بەلگەش بۆ ئەوە، ئەم چەند دیرەیە کە وەك پیشــەکییەك بــۆ دیوانــی "رۆژانــەی ژنیکــی بــێ موبــالات" نووسیوتەو، دەلییت:

"بلێی چەپگەردیی قەدەر لەوەدا نەبیت کە ئەز بە زمانی ژنان هاوار بکەم و، ژنان خۆیان نەتوانن بـە دەنگـی سروشـتیی خۆیـان هاوار بکەن؟ ئەی ژنان بۆچی بیدەنگ دەبن؟".

لەو بروایەدام، ئەگەر ژنان بیانەویت چاك دەزانن هاوار بکـەن، دەنگیشیان هەمیشە لەکاتی پیویسـتدا تـەیارو ئامادەیـە.. وەکـی تریش پیویست بەتۆ ناکات کراسی ئافرەت بپۆشیت یـاخود کلـی چاوانی ئەو بخوازیت..

***نزار قەبباني:**

-مـرۆڤ کـاتیك دەچیتـە شـەریکەوە، پیـش وەخـت قەناعـەتی بـە سـەرکەوتن بـەهیزەو، باوەریشـی بـە بردنـەوە هینـدە پتـەوە قـابیلی گفتوگـۆ نییـە.. ئەگـەر وا نەبوایـە نـە جەنگەکان بەرپا دەبوون و نە جەنگاوەرانیش دەخولقان..

لە سالانی پەنجاکاندا، تەوژمی ئازادیخوازیی لە لوتکەیدا بوو و، هیواکانیشمان بە یەکیتیو، رزگاربوون و گۆران، ئەو مەشـخەلە داگیرسـاوانە بـوون کـە لـە ناخمـاندا بلیسەیان دەهات..

یەك بەخۆشم، خەمی رزگاربوون، خەمیکی سەرتاپاگیریی بـوو، بـە واتـای ئـەوەی مـن هیلـی جیاکردنـەوەم لـە نیـوان رزگـاریی نەتـەوەییو، ئازادیی سایکۆلۆژیی و کۆمەلایـەتی و جنسـیی مرۆڤـی عـەرەبدا، نەکیشـابوو، خـۆم وابەسـتەی سیستمی ریزبەندیی و، ریکخستنی کرۆنۆلۆژییانەی شۆرشە عەرەبییەکان نەکردبوو..

ئەو قسەیەش کە لە پیشەکی "رۆژانەی ژنیکی بێ موبالات"دا وتومە، ئەوە لە زستانی سالی ١٩٥٨دا نووسراوە، واتا لە مانگەکانی سەرەتای پرۆژەی یەکیتیی نیوان میسرو سوریا بە سەرکردایەتی جمال عبدالناصر..

لەو سەردەمی "کیبریائەشدا" پانتایی خەون بۆ لە ئامیزگرتنی ئاسمان و.. پانتایی زمانیش بۆ سەرجەم خواستەکانی فکر، هەتا دەهات فراوان دەبوون..

دواتر، زەمەنی شکست و دارمانەکان هاتەپیشێ..

خەونەکانیش وردوخاش بوون و لەگەلیشیاندا ئەبجەدییەت و مندالیتی وردوخاش بوون و گولی ئازادی سیس هەلگەراو، مرۆڤی عەرەبیش زیاتر لە کوللەیەکی ناو بیابان، دووچاری برسیتی و تینویتی بوو..

لە سالانی پەنجاکاندا، خەونم بە ژنیکەوە ئەدی کە گۆی زەوی بەدەریاو شاخ و خۆرو شەوو رووبارو ئەستیرەو مندالەکانیەوە لەگەلدا بەش بکەم.. ئەوکاتە؛ خەون، خەونیکی جوان و عادیلانە بوو.. شایانی ئەوە بوو لە پیناویا بمریت..

لیرەوە، ناکرێ لە سالآنی هەشتاکاندا، لە بارەی خەونی سالآنی پەنجاکانەوە سەرکۆنەم بکەیتو لیم بپیچیتەوە.. بۆت نییە ریگە لە مندالیتییم بگریت کە مندالیتیی خۆی پیادە بکات و.. ناشتوانیت پرسیاری ئەوەم لیبکەیت؛ بۆچی لە پەنجاکاندا ئەز کراسی ئافرەتیکم پۆشیوەو.. کلی چاوانی و ئەنگوستیلەو گوارەکانیم خواستووە..

لـه سـالآنی پـــەنجاکاندا، شـــانۆگەرییەك هـــەبوو بـــەدوای پالەواندا دەگەرا.. قەدەری منیش ئەوەبوو کە لە کۆرو کۆمەلە خواپیداوەکانەوە بیمەدەریّ.. بۆ ئەوەی تەعبیر لەوە بکەم کە لـەناو ئـەو کـۆرو کۆمەلآنـەدا رووئـەدات.. چ کەسـیك ئـەوەی بەسەردا نەسەپاندووم کە ئەو رۆلەی خۆم بگیرم.. وەك چۆن کەس ئەوەی بەسەر هاملیتدا نەسەپاندووە کە هاملیت بیتو، بەسەر ئۆتیللۆدا کە ئۆتیللۆ بیت..

هـەموو ئەوەشـی کـە دەرکـم پیدەکـرد ئـەوەبوو کـە ئـەز قەناعـــەتم بـــە بایـــەخی شـــانۆگەرییەکەو، بـــە دەقـــی شانۆگەرییەکەش هەبوو کە بە دەنگیکی بەرزو حەماسەتیکی بیّ وینەوە دەمخویندەوە..

لە لەحزەیەك لـە لەحزەکـەکانی غروردا وام خـەیالّ دەکـرد کـە دەتـوانم ببمـە ئەسـکەندەری مەکـەدۆنی و هـەموو دنیـا داگیربکـــەم و، ســـوپایەکیش لـــە ژنـــانی جـــەنگاوەر لـــە پیشتمەوەن..

بەلآم لە گەرمەی ئەو خەیالەمدا کاتیّ ئاورم بـۆ پشـتەوەی خـۆم دایـەوە بـۆ ئـەوەی شـوین و پیگـەکانی سـوپاکەم بەسـەر بکەمەوەو لە ورەی بەرزیان دلنیابم.. لە سەنگەرەکاندا جگە لە شـــانەی شـــکاو و.. شووشـــە عـــەتری بـــەتالّو.. پیـــلاوی پاژنەبەرزی دەستکردی شارل گۆردان و.. ماگلی.. هیچی ترم بەدی نەکرد..

جـەنگ، هـەر جـەنگیك بـیٚ، لانـــی كـەم لــە قوربـانیدانی جەستەیی و ئابووری و كۆمەڵایەتی  دەویت و، هـەروا دەست بەردارنیشـــی لــەو حالــەتی نـــازو نیعمـــەت و حەســانەوەیە پێویستە كە ئەقلیەتی كۆمەلگاكانی حەریم پیك دەهینن. بەڵام وا پیدەچیـت ژن لـە بـارودۆخی ئـابووریی میژوویـی خـۆی ئاسوودە بیت چ باكیكی بەگۆران و چاككردنی نەبیت..

تاقــە ئامـــانجی ســـتراتیژی ژن ئەوەیـــە كـــە مایـــەی حەزلیكردنو ئارەزوو راكیشان بیت و.. توانـای راكیشـان و رامكردنـی نیرینـەی هـەبیت و، ملكـەچی سیسـتمی دەزگـایی (نظام المؤسسة)ی بكات..

هـەر لەســـەر پیودانگـــی ئـەم ســـتراتیژییەتە گشـتییە، چ جیاوازییەك نییە لەنیوان مەدام كۆری و بریجیت باردۆ، نیوان سیمۆن دۆبۆڤوارو نەجوا فوئاد ی سەماكەردا..

٣

*محیی الدین صبحی:

ئـەو دیاردەیـەی كـە لـــە نووســـینەكانی بانەگەشــە خوازانـــی ئازادكردنی ژندا وەك دیاردەیـــەكی دژو پیچەوانـەی بانگەشـەكەیان دووچاری سەرسورمانم دەكات ئەوەیە ئەوان بــە جـەورو سـتەمیكی نویٚی زیاتر لە جەورو ستەمە كۆنەكەی پیشتر مامەلەیان كـردووە: كەسیك لـەوان بایـەخی نەداوەتـە ئـەوەی لـە ژن بپرسیت كـە چـی

دەویت؟ کەچی هاوزەمان لەگەڵ ئەو نەپرسینەدا، هەریەك لەوانە دەستنیشان کردن و چارەسەرو داو و دەرمانی نەخۆشییەکەی پییەو نەخۆشەکەش دیار نییە یان ئامادەنییە، یاخود هۆشی بەخۆی نییە.. ئەوەش وا دەکات کە دەستنیشان کردنەکان لەلایەن ئەوانەی بایەخی پێ ئەدەن وەك ئەوەی لی دیت کە لە هەوادا رەسم بکەن.. یاخود لە کۆمەلی هیلی رووت و قووتی زەینیی دەچن هەرکاتیك بەر واقیع دەکەون، هەلاهەلا دەبن..

ریگەم بدە بە راشکاوی گفتوگۆت لەگەلدا بکەم، وەك ئەوەی ماوەی چارەکە سەدەیەکە پیکەوە بەو راشکاوییە راهاتووین؛ ئەز لەو بروایەدام نزار قەببانی، بەتەنێ (ژن)ی خەونەکانی خۆی لە زولمی پیاوانەی خۆی رزگار دەکات و، هەر نووسەریکی عەرەبیش وینەی ژنی ئازادکراو بەپێی ئارەزووەکانی خۆی دەکیشیت.. بۆیە قسەکردن لە بارەی ژنی ئازادەوە، لە قسەکردنی هەمان ئەو نووسەرە دەچیت لە بارەی شاکچی خەونەکانی خۆیەوەو، قسەکردنی لە بارەی کچە پالەوانی چیرۆکەکان یاخود فیلمە پەمەییەکانەوە..

ئەگەر بمانەویت کەسانیکی جددی بین، نەك شۆرشگیری ناو هۆلەکان یاخود تیۆریستی ناو گازینۆکان، ئەوا دەبیت ئەو راستییە بزانین کە ژنی عەرەب لە ئاستی واقیعیکی هەستپیکراودا، هاوبەشی هەمان ئەو نەخویندەواری و برسیتی و

پلیشانەوەیە دەکەن کە پیاوی تیدا دەژی و، کیشەی ژن لە هیی پیاو جیا نابیتەوە..

*نزار قەببانی:

-پیویست ناکات پرسیاری ئەوە لە ژن بکەین کە چیی دەویت..

چونکە هەمووومان دایک خوشک و، کچ و، ژن و، یارو خۆشەویستمان هەن.. ئەو زولمەشی لە ژن دەکریت پروپاگەندەیەک.. یان خورافەتیک.. یان تابلۆیەکی سوریالیی نییە.. بەلکو زولمیکی بینراو و بیستراوەو.. لەسەر شاشەی ژیانی رۆژانەمان بەردەوام نمایش دەکریت.. هەروەها زولمیکە وەک شاخ و دۆڵ و رووبارو بیابانەکانی نیشتمان نەگۆرو چەسپاوە..

ئەگەر ژنی عەرەبیش نوتقدانی نەمابیت، یاخود بەپیی مەرسومیک کە پیاو دەری کردووە قسەکردنی لی قەدەغە کرابیت، یاخود وەک -تۆ دەلییت- ئەگەر هۆشی بەخۆی نەمابیت.. ئەمە ریگە لە نووسەر ناگریت (مەبەست لە نووسەری پیاوە- وەرگیر) کە جیگەی ئەو رووشاویی و شکاویی و ئەو پەلە شین و مۆرانە دەستنیشان بکات کە سەرتاپا جەستەی ژنی لە گوێی مەمکەوە هەتاکو بەری پییەکانی گرتۆتەوە..

تۆ، بەو راشكاوييەی كە ئەز پيم خۆشە، دەلييت: "نزار قەبباني بەتەنێ –ژن–ی خەونەكاني خۆی، لە زولمی پياوانەی خۆی رزگار دەكات". منيش بە هەمان راشكاويی كە چارەكە سەدەيەكە تۆم پيی ئاشنا كردووە، پيت دەليم: بەلێ.. ئەز ئەوە دەكەم.. چونكە منيش نيرينەيەكم لە نيرينەكاني قەبيلەو.. سوپەرمانيك.. ياخود لۆرديك نيم لە لۆردەكاني گەرەكی مايڤير لە لەندەن..

ئەز، قەبيلە گەمارۆی داوم و.. راوەدووم دەنيت و.. دەيەويت ناچارم بكات دەستی شيخی عەشيرەت ماچ بكەمو.. دواجار، ريگەم نادات بچمە ژواني مامزيك.. بەلام ئەز هەميشە گالتەم بە رەوشتەكاني عەشيرەت هاتووەو ئەوەم رەت كردۆتەوە كە دەستی شيخی عەشيرەت ماچ بكەم و.. بگرە زياتر لەوەش، بەناو بريقەی خەنجەرەكان و، سەگوەری پاسكردندا، پيدزكەم بۆ ژير دەواری مامز كردووە.. لەو دەوارەی مامزدا، كاتيكی وا نەرەخساوە هەتا كۆنووسيك بۆ ليكۆلينەوە لە گرفتەكاني مامز بنووسمەوەو، دواتريش؛ ئيعتيرافەكاني لەسەر كاسيتيكی ڤيديۆ تۆمار بكەم.. چونكە نە خەنجەرەكان و، نە سەگەكاني پاسكردنيش، ئەو بوارەيان نەداوە بۆ ئەو كارە..!

ئيتر بەو جۆرە هاواری نووسەراني عەرەب سەبارەت بە ئازادی ژن، هاواريكی پچرپچرو.. گرژو.. شەخسی و.. خوديی و.. پر لە توورەيی بووە.. ئەمەش شتيكی زۆر سروشتيە.. چونكە ئەوكاتەی ئيمە هاوارمان دەكرد، ژنمان لە

تـەكدا نـەبوو، بـەلكو بـە دزييـەوەو لـە درزی دەرگاكانـەوە دەمانهينانە ناو هاوارەكانمانەوە.. نەك هەر ئەوە، بەلكو ئيمە (ژن)مـان بـە خـەيالٚ دەخولقـاندو وەك چـۆن هونەرمـەنديكی تەشـكيليی، بەهيزی خـەيالزايندەيی و بە رەنگـەكانی خـەون تابلۆكەی دەنەخشينيت، ئيمەش ئاوا ژنمان دەنەشخاند..

شـتيكی زۆر سروشتيشـە بـەو جـۆرە وينـەی ژنـی ئـازاد بكشيم كە خودی خۆم وينـای دەكـەم و.. پاشـان هـەولبدەم سـەرەتا لـە چـەنگالی خـۆم و، لـە ددان و كەلبـەكانی خۆمـی دەرباز بكەم..

لـە قەسيدەكەمدا، "ژنيكـی سـك پـر"؛ گلـەيی و گـازەندە بەتـەنیٚ نابارێتـە سـەر سـەری نـزار قـەبباني، بـەلكو دەبارێتـە سەر سەری هەموو پياوان.. لە قەسيدەی "رۆژانەی ژنيكی بیٚ موبالات"يشـدا، نـەفرەت بەسـەر هـەموو نيرينـەكاندا، بە نـزار قەببانيشەوە، دەباريت..

كەواتە.. ئەز لە نووسينەكانمدا، بانگەشەی ئەوە ناكەم كە پەيامبەريكی ئاسمانيم و هاتووم بۆ ئەوەی ژن لـەناو شيشـە ئاسـنينەكانی زيندانەكەيـەوە بهينمـە دەرەوە، چونكـە ئـەوە بـاش دەزانم كـە منيـش لەگـەلٚ ئـەودا پيكـەوە لەهـەمان زيندانينو.. حوكمدانـی هـەردووكمان هـەر يـەك حوكمدانـەو، ئەو دادوەرەش حوكمەكەی دەركردووە، هەمان دادوەرە.. خـۆ ئەگـەر پيـاو بـە حوكمـی بۆمـاوەيی (الوراثـة)، هـەنديك

دەسـتکەوتی میژوویـی بـۆ خـۆی قـۆرخ کردبیـت و، تـاکو ئیسـتاش وەك کەلەشیر شـانازیی بـە پـەری فـش و قووقـەی خۆیـەوە بکـات، ئـەوا لـە راسـتیدا حـالی ئـەو لـە حـالی مریشـکەکانی باشـتر نییـە.. ئـازادیی ژن، ئەلقەیەکـە لـە ئەلقەکانی ئەو زنجیرە ئاسنینەی کە مرۆڤی عەرەبی لە ساتی لەدایك بوونیـەوە تـا سـاتی مردنـی، لەمسـەر بـۆ ئـەو سـەری نیشتمان، کۆت و پیوەند کردووە..[18]

ناشکریَ ئەم ئەلقەیە، بەبیَ شکاندنی ئەلقـەکانی تـر بـە تەنیَ بشکیندریت.. ئـەو ئەلقانـەی کـە دەست و پـیَو، فکرو، خەونـەکان و، غـەریزەی جنسـی‌ی مرۆڤـی عـەرەبیان شەتەك داوە.

سیسـتمی کۆمەلاّیـەتیی کۆمەلگـەی عـەرەب، وەك گشـتیك (ککل)، پیویستی بە چاوپیداگیرانەوە هەیە..

ئـەوەی مـن و، غـەیری منیـش، ئـەنجاممان داوە، جگـە لـەوەی کـە شۆرشـیکی بچووکـە دژ بـەو سیسـتمە بەردینـە دەسـەلاّتخوازەی کـە راسـتکردنەوەی پیویسـتی بـە هـەزاران شۆرشی بچووك هەیە، هیچی تر نییە.

[18] لە دەقە ئەسلییەکەدا نزار وتویەتی: "من ام القوین الی طنجة" واتا لە – ام القوین–ەوە هـەتا –طنجة، کـە دەکاتـە ئەمسـەرو ئەوسـەری نیشـتمانی عـەرەب. بۆیـە ئیمـە وەك مانـا گشـتیگرییەکەی تەرجەمـەمان کـردووە– وەرگیر.

*** محی الدین صبحی:**

**-ئەو نووسەرانەی، بێ ئەوەی رای ژن وەربگرن، رزگاری دەکەن.. وەك ئەوە وایە پارلەمانیك دابمەزرینن، کەچی لە بیریان بچێت نوینەرانی گەلی بۆ بانگهیشت بکەن.**

**نموونەی ئەم جۆرە بیریارانە!! بریاری وا دەردەکەن کە بەتەنێ گیروگرفتەکانی خۆیان چارەسەر دەکات نەك هیی ژنان.. ئەگەر وا نییە دەسا پیم بلێ؛ بەدریژایی سەدەیەك گفتوگۆو پیلەبازی، فکری عەرەبی چیی بەخشیوەتە کیشەی ژن؟**

***فیرکردنی ژنان؟**

**ئەی ئەوە نییە ژمارەی ژنە شاعیرەکان-ی سەردەمی جاهیلیەت بەقەد ژمارەی شاعیرانی پیاو بوون لە هەمان سەردەمدا.. لە سەردەمی سەرەتای ئیسلامیشدا هەر بەو جۆرەو.. خۆ ئەو کاتیش و هەر لە رۆژگاری (الخنساء) و (هند بن عتبه)و، (لیلی الاخیلیه)وە ژن فیرخوازو شۆرشگیر بووە..**

***ئەی فکری عەرەبی، ئازادیی ژنی لە هەلبژاردنی هاوسەرەکەیدا، دەستەبەر کردووە؟ ئەوە نییە شەرع، زەواجی وەك عەقدیك داناوە کە بە رەزامەندیی هەردوولا نەبیت، ئەو عەقدە تەواو و راست دەرناچیت..!**

***ئەی ئازادیی ژنی لە خۆشەویستییدا فەراهەم کردووە؟**

له بەرامبەر ئەمەدا دەلیم، تەنانەت ئەوروپاش له سەدەی رابردووەوەو[19] لەگەڵ بزوتنەوەی رۆمانسیزم و سەرەتاکانی شۆرشی پیشەسازییدا خۆشەویستی‌ی عاتیفی ناسیوە.. بگرە لە شەستەکانیشەوە ئەوروپا ئازادیی جنسی‌ی ریگەپیداوە، واتا دوای بیست ساڵ له دۆزینەوەی هۆیەکانی منداڵ نەبوون. ئەوەش بەلگەی ئەوەیە کە کۆمەڵ هەر کۆمەلە لەهەر زەمان و زەمینیکدا بیت.. مەسەلەی یاخیبوونیش، ئەوەیان بازدانیکی نائاسییەو (استثنائیه) و ناکریتە پیوەر..

***نزار قەببانی:**

-کام پارلەمان؟ کام ئەنجومەنی گەل، کام ئەنجوومەنی راویژکاریی؟ کام کۆنگریس؟

پیاوی عەرەب کە ریگە نەدات ژن لەگەلیا لەسەر میزو سفرەی خوان دابنیشیت، ئیتر چۆن ریگەی پیٚ ئەدات بەشداریی پۆستی سەرۆکایەتی یان وەزارەتی لەگەلدا بکات.. یاخود حوکمرانیی لەگەلدا بەش بکات؟ تۆ لە خستنە رووی گیروگرفتەکەدا بەم شیوەیە، وەك یەکیك لەو رۆژهەلاتناسانە دیيتە بەرچاو کە هەوڵ ئەدەن بەهۆی راڤەکردنی دیوانی (ابن الرومی)یەوە، رۆژهەلات بدۆزنەوە..

ئەگەر نووسەران و بیریارانیش بریارگەلیك بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی خۆیان، نەك گیروگرفتەکانی

---

[19] مەبەستی سەدەی نۆزدەهەمە- وەرگیر.

ژنـان، دەربکـەن.. ئـەوا ئـەم دیاردەیـە، دیاردەیـەکی باشــە.. چونکـە چارەسـەر کردنـی گـیروگرفتی پیـاو، بـە شـیوەیەکی ئوتوماتیکی دەبیتە هۆی چارەسەر کردنی گیروگرفتی ژن..

بۆچی ئیعتراف بەوە نەکـەین کـە پیـاوی عـەرەب سـەری گلۆلـەی گیروگرفتەکانە.. چونکە ئەگـەر پیـاو بگۆریـت، ئـەوا ژنیش بەشیوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەگۆریت..

ژن، ناتوانیت لە سایەی پیاویکی کۆیلەدا ئازاد بیت و.. ناشتوانیت لە سیبەری پیاویکدا قسە بکات کە ئیعتراف بە وشەی مێینە نەکات.. سەبارەت بەوەشی کە فکری عەرەبی بە دریژایی سەدەیەك گفتوگۆ، چیی بۆ کیشەی ئافرەت کردووە، ئەز لەو بڕوایەدام –بیگومان لیرەدا لەگۆشەنیگای شیعرەوە قسە دەکەم– کە ئەم فکرە کاریکی هاندەرانەی لەناو زیندانی ژناندا ئەنجام داوە.. ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەدەستکەوتێ لە قەلـەم ئـەدرێ. بـەڵام ئەگـەر هـەندێ لـەو ژنـە زیندانییانـە مانەوەیان لەو دۆخەدا پێ چاکتر بیت کە تیایدان، چونکە بە تـاریکیی راهـاتبوون و لەگـەڵ شیشـە ئاسـنینەکاندا هـەلیان کـردووە، ئـەوا لـەم بـارەدا خۆیـان بەرپرسـیارن، نـەك فکـر یاخود شیعر..

سـەبارەت بـە فـیرکردنی خویندنـەوەو نوسـینیش، ئـەم پرۆسـەیە ریژەی لـە سـەدا یـەکی گرفتەکە چارەسـەر دەکـات، نەك هـەموو گرفتەکـە.. چونکـە ئازادی شتیکەو.. نەهیشـتنی نـەخویندەواری شـتیکی تـر.. هـەروەها خویندنـی کتیبـی (صـەرف و نـەحو) شتیکەو.. خویندنـی کتیبـی ژیـان شـتیکی

تر.. بەلگەش بۆ ئەوە، زۆربەی ژنە خویندەوارەکانی ئیمە، هەتا ئیستاش بەهەمان لۆژیکی دایك و نەنکیان، لە کاروباری خۆشەویستیو شووکردن و مارەییەوە ئەدوین و.. ئەو مەرجانەی ئەوان دەیسەپیننە سەر ئەو پیاوەی دیتە خوازبینییان، ئیسرائیلیش مەرجی لەو جۆرە بۆ گەراندنەوەی زەوییە داگیرکراوەکان ناسەپینیت..

کەواتە، پیویستە و هەر دەبیت گۆران لە رەگ و ریشەی ژیاندا بکریت، نەك لق و پەراویزەکانی..

سەبارەت بە کیشەی ئازادیی خۆشەویستیی، یاخود ئازادیی جنس.. ئەوانە باس و خواسیکی پر وردەکارییئ و لەکاتی گونجاویاندا دینە پیشێ.. بە واتا، ئەو کاتەی کە تیایدا کۆمەلگەی عەرەب ئیعتراف بە تواناو مافی ژن لە دیاریکردنی چارەنووسی خۆیدا، دەکات..

ئەوکاتەی ژن، وەك مرۆڤیکی ئازادو بەرپرسیار، پیگەی خۆی وەردەگریت و، ئەوکاتەی لە رووی سایکۆلۆژی و، جەستەیی و، ئابوورییەوە پیاو دەستی لی هەلدەگریت، ئەوکاتە ئەم کیشوەرە، ئەم شەرە خاچ پەرستانەیە (الحرب الصلیبیە)ی نیوان نیرینەیەتی و میینەتیی لە کۆل دەبیتەوەو بۆ هەتایە ئاسوودە دەبیت..

٥

*محی الدین صبحی:

-بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا فکری نەمەییوی عەرەبی، لە دەست بردنی بۆ کیشەی ژن، دووجار تووشی نشوست هینان بووە. جاری یەکەم، ئەوکاتەی کیشەی ژنی لە کیشەی پیاو جیاکردەوە. چونکە قسەکردن لە ئازادیی، قسەکردن لە گشتگیریی. تۆ کۆمەلیکی دیموکراتیی دامەزرینە، ئەوسا دەبینیت کە ژنان چۆن بەهرەمەند دەبن لە کاروباری تایبەتیی خۆیاندا، هەروەها لە کاروباری گشتیشیاندا.. تۆ یەکسانیی راستەقینە لە رەخساندنی هەل و مەرجەکاندا بۆ سەرجەم هاولاتیان فەراهەم بهینە، ئەوسا چەندین ژنی هەلکەوتوو دەبینیتەوە کە کێ بەرکێی براد‌ەرە پیاوە هەلکەوتووەکانیان دەکەن.

لە کۆمەلگاکانی هەلپەرستییشدا، ئەو کۆمەلگانەی تیایاندا هەل و مەرجەکان تەنها بۆ کەسانی کاسەلیس و هەوادارانی عەرش و دەسەلات رەخساون، ژنان دەبنە بەشیك لە پرۆسەی بەرتیلکاریی و بەد دابەشکردن (سوو التوزیع)، ژنان خۆشیان بە خیرایی بەشداریی لە گەمەکەدا دەکەن.

جاری دووەمیشیان فکری عەرەبی لەوەدا شکستی هینا، کاتیك گیروگرفتی (ژن)ی وەك ئیشکالیەتیك کە بە دووی چارەسەریکی مامناوەندا دەگەریت، خستەروو: فکری عەرەبی، بانگەشەی ئازادیی ژن دەکات و، کەچی دواتر پاشەکشە دەکات و

پاساویشی ئەوەیە ئەم ئازادییە[20] لە باکوورەوە سنووردارە بە داب‌و نەریت و، لە باشووریشەوە بە عورف و، لە رۆژهەڵاتەوە بە عەقڵ و، لە رۆژئاواشەوە بە کلتور یان رەسەنایەتییەوە..

ئەم فکرە، بانگەشەی ژن دەکات بچیتە مەیدانی کارکردنەوە، پاشتر هەڵدەگەریتەوەو، ئەوە بیری ژن دەخاتەوە کە ئەو دایك و هاوسەرو خوشك‌و.. هتدە..

داوا لە ژن دەکات بەشداریی خەبات بکات، بەڵام لە سنووری وزەو خۆبەخشیندا..

بە کورتی؛ فکری عەرەبی ئەوەی هەولی بۆ ئەدات کە بەدەستی راست پیشکەشی ژنی بکات؛ بەدەستی چەپ لی‌ی ئەدزیتەوە..

*نزار قەببانی:

–ئەز کۆکم لەگەلتا کە هیچ جیابوونەوەیەك لەنیوان کیشەی ژن و کیشەی پیاودا نییەو.. قسەکردن لە ئازادایی، قسەکردنە لە گشتگیریی.

نەبوونی دیموکراسی، بنەمای گیروگرفتەکەیە لە کۆمەلگەی عەرەبیداو ئەوەشی تۆ باسیان دەکەیت هەموویان بەلگەنەویستن.. ئەوەی بەسەر سیاسەتدا دەچەسپیت، هەمان

---

[20] لە جوگرافیایەکی گەمارۆدراوی نەفرەتیدا– وەرگیر.

شتە کە بەسەر خۆشەویستیشدا دەچەسپیت..[21] جا لەبەر ئەوەی لە سیاسەتدا ئیمە نەخۆش و دەردەدارین، کەواتە لە رووی عاتیفیو.. عەقلی و.. جنسیشەوە ناتەواو و عیللەت دارین..

لە کاتیکدا ئیمە لە بواری سیاسەتدا نەمانتوانیبیت یان لەوە بێ تواناتر بین کە یەکیتییەکی تیکەلاوبوون[22] یان یەکیتیەکەی فیدرالی، یان کۆنفیدارلیی لە نیوان دوو دەولەتی عەرەبیدا دابمەزرینین.. ئیتر چۆن دەتوانین یەکیتی‌ی نیوان پیاوی عەرەب و میینەی عەرەب رابگەیەنین؟

هەروەها، وەك چۆن فکری عەرەبی، فکریکی کەرتخوازو دابەشگەرایە و فکریکی دەستەگەراییە.. هەر بەو جۆرەش فکری عاتیفی و جنسی‌ی عەرەب، فکریکی کەرتخوازو.. خۆپەرستانەو.. نەرجسیانەیە..

عاشقی عەرەب، هەر لە یەکەم لەحزەی ژن هینانیدا، بیر لە تەلاقدانیشی دەکاتەوە..

ئەگەر تا ئیستاش، فکری عەرەبی، لە هەلویستەکانیدا بەرامبەر ئازادیی ژن، فکریکی پەشۆکاو و پر لە ئاژاوەو گومرابیت، هۆیەکی ئەوەیە ئەو فیکرە هیشتاکە لە نوختەی

---

[21] واتا ئەوەی ناجۆرو ناتەواوییە لە سیاسەتدا، هەمان شت لە خۆشەویستیشدا هەیە- وەرگیر.

[22] وحدة اندماجية- زاراوەیەکی سیاسییە- وەرگیر.

ناوەراستی نیوان چەرخی جاهیلیەت وچەرخی کۆمپیوتەردایە.. هیشتاکە کراسی هیپپیەکان لە هەندەران دەپۆشیت و، کەچی لە ناوەوەی نیشتماندا عەمامە لەسەر دەکات. فکری عەرەبی، هەتا دەستبەرداری داخرانی خۆی‌و، دووفاقییەکەی و، گریّو گۆلە ئالۆزییەکانی نەبیت، هەرگیز خۆی نادۆزیتەوە..

*محی الدین صبحی:

-لە کتیبی "لە بارەی شیعرو جنس و شۆرشەوە" دەلییت:

"هەتا واز لەوە نەهینین کە جەستەی ژن ئەو ئاوەیە پەنجەو ئارەزووەکانمان تیایدا مەلە دەکەن و، واز لەوە نەهینین کە ئەو جەستەیە بە دیواریك بزانین و شەهامەت و گوللەی دەمانچەکانمانی لەسەر تاقی بکەینەوە؛ ئازادیی شتیکی مەحالە.. جنس سەرئیشەی گەورەی ئیمەیە لەم ناوچەیەداو.. پیوەریکی سەرەتایی و کۆنینەیە بۆ سەرجەم ئەو ئەخلاقیاتەی کە لە بیابانەوە لەگەڵ خۆماندا هەلمان گرتوون."

گەر ریم بدەیت، وام بە زەیندا دیت کە وەلامی ئەو چەند دیرە لە چەند لایەن و ئاستیکەوە بدەمەوە.

ئەز پیم وایە ئەو سەدو ئەوەندە ملیۆن عەرەبەی کە هەن، ئەگەرچییش لە (هارڤارد) بیانخویندایەو، لە (ئۆکسفۆرد)یش

دەربچوونایە.. سلوکی عاتیفیان شتیك سەرکەشیی هەر تیدا دەمایەوەو، سلوکی جنسیشیان شتیك لە درەندەییتیی پیوە دەمایەوەو، لە سلوکی خەیال زەدەییشیاندا شتیك لە حیکایەتی هەزارو یەك شەوە دەمایەوە، بەجۆریك نیرینە، هەر ژنیکی بکەویتە بەردەست، قۆرخی دەکات.

عەرەب، هەر عەرەبن و.. نە دەبنە ئینگلیزو نەش دەبن فەرەنسییەکان.. ئەز ئەمە بە کاریکی ناجۆری وا نابینم کە شەرمئاوەر بیت بۆمان، چونکە مافی خۆمانە کە جیاواز بین لە ئەوانی دی (الاخرین) و.. ژنی عەرەبیش لەلای خۆیەوە حەز لە پیاویك ناکات و هەلی نابژیریت کە خەسلەتی دوودلیی و خاو و خلیچك و نیرەمووك بیت.. سەیر لەوەدایە لە زۆربەی ئەو رۆمان و شیعرە عەرەبییانەی کە خویندوومنەتەوە، تیایاندا ژنی عەرەبم بەو خەسلەتانەوە نەدیوەتەوە کە ئەزو تۆش ژنیان پێ دەناسین.

تەنانەت نووسەر ژنەکانیش نمایندەیی ژنانیان بەو خەسلەتە راستەقینانەوە نەکردووە کە خودی ژنان هەیانەو.. وەکی تریش تایبەتمەندیتیی سلوکی عاتیفیی- جنسیی لەلای عەرەب، لە ئەدەبی نوێی عەرەبیدا ونەو.. لەلایەکی تریشەوە، کۆمەلگەیەك نەبووە کە ئیباحیەت بەو حالەتی لەبەریەك هەلوەشانە ببەخشیتو، سزای ئەو کیشەیەی وەزیری بەرگریی بەریتانیا (جۆن پرۆڤیومۆ)و ژنە عەشیقەکەی (کریستیان کیلەر)، هەمان سزایە کە لە سەرجەم کۆمەلگەکانی تریشدا دووپات دەبیتەوە، رەنگە هۆیەکەشی

ئەوەبیت هەروەك فرۆید دەلیت، چونكـە شارسـتانییەت لـە بـواری حەرام كراوەكانەوە (محرمات) نەبیت، گەشە ناكات..

*نزار قەببانی:

-لە شیوازی پرسیارەكەتدا، وام دیتە بەرچاو كە تۆ سەر بەو گروپە بیت باوەریان وایە: (لە تواناادا نییـە داهینـانیك بەرپا بیت لـە داهینانی پیشوو باشتر بیت) و، عـەرەبیش - لـەرووی رەگـەز-ەوە مـەزنترین نەتـەوەن كـە بـۆ خـەلكی خولقینراون..!

ئـەمجارەیان ریگـەم بـدە كـە شـیكردنەوەو مۆدیلـەكانی راڤەكارییت و ئەو دەمارگیرییە ئەتنیكییـەی (رەگەزییـەی) كـە بۆ كەلیتیی خۆمانت هەیە، رەت بكەمەوە..

ئـازیزم: كتیبـی هـەزارو یـەك شـەوە، كتیببكـی پـیرۆز نییـە تـاكو لییـەوە فـیرببین چـۆن نیرینـە هـەزارو یـەك ژن بـۆ خـۆی قـۆرخ دەكـات.. ئـەم هەلویسـتە، نـە خۆشەویسـتییەو.. نـە جنسەو.. نە میراتیكی نەتەوەییشە- هەروەك شیكردنەوەكەی تـۆ وای دەگەیـەنیت-.. بـەلكو قـەتڵ و عـام و دانـانی قەسابخانەیەكە بۆ رەگەزی دووەم..

ئەو قسەیەت كە دەلییت (عەرەب، هەر عەرەبن) لەو قسەیە دەچیت كـە بلییـت: بـەرد هـەر بـەردەو.. بزمـار هـەر بزمـارەو.. كەمتیاریش هەر كەمتیارە..

بـەوەش تـۆ عـەرەب دەخەیتـە نـاو شووشـەیەكەوەو سـەرەكەی بـە مۆمـی سـوور مـۆر دەكـەیت و سـووننەتی

پەرەسەندن و گۆرانیـان لی حـەرام دەکـەیت، هـەروەك ئـەوەی ئەتنیك (رەگەز)ی نمونەیی –بەپیی تیۆرییەکەی تۆ– بریتـی بیت لە پرۆسەی کوشتن و برین و داگیرکردن و.. خوانیك بیت تیایدا بخۆرو خوراو هەبن.

بیگومـان مـن داوا لـە عـەرەب ناکـەم کـە ببنـە ئینگلـیز.. یاخود سویدی.. خواست و ئاواتیشم ئەوە نییە کە بیابانی (الربع الخـالی) بکەمـە سـیبیریا.. بـەلکو ئـەز داوای گۆرینـی شـیوازی مامەلــەکردن لەگــەلّ ژن و، کۆتاپیــهینانی قۆنــاغی دەرەبەگایەتی لە پەیوەندیمان لەگەلّ ژندا دەکەم.

ئەز داوای (بە ئیسنانیی کردنی) پەیوەندیی نیوان پیاوی عەرەب و میینەی عەرەب دەکەم و، دەخوازم ئەو پەیوەندییە روونترو پر سۆزتر بیت..

لەوەشدا کۆك نیم لەگەلتدا، کاتیّ پیاوی عەرەب دەخەیتە بەردەم دوورییانیّ:

یـان ئـەوەتا پیـاو ببیتـە کـەمتیاریّ، یـا تیمسـاحیّ یـان (بلـدۆزەریّ) و ئیسـك و پروسـکی ژن بـهاری، یـاخود ئـەوەتا ببیتە نیرەموکیك لە بەردەم ژندا..

پیاوەتیی؛ لە لیدان و کوتان و مل هەلکەندنا نییە..
ئەگەر وابوایە گاسن سەروەری عاشقان دەبوو..

پاشان بەهرەمەند بوونی ژن لە مافەکانی خۆی لە ریگەی تەعبیر کردن لە خواست و ئارەزووەکانیو، پیاسەکردن لەگەلّ

خۆشەویستەکەیدا لە شەقام و شوینە گشتییەکان و، ناوهینانی خۆشەویستەکەی، مانای لیك هەلوەشانی پیودانگی ئەخلاقیی ناگەیەنیت. سەرەتا بە کیشەکەی (پرۆڤیۆمۆ)ش کە ئاماژەت بۆ کرد، یاسای بەریتانیی بەو هۆیەوە سزای بەسەردا نەسەپاند لەبەر ئەوەی پەیوەندییەکە، پەیوەندیی خۆشەویستی‌ی نیوان پیاو و ژنیك بوو، –کوا لە ئەوروپادا شتیك هەیە ناوی تاوانی خۆشەویستی بیت–، بەلکو سزاکەی لەسەر ئەوە سەپاند، چونکە پەیوەندییەکە؛ پەیوەندیی وەزیریکی بەرگریی کە بەرپرسی هەرچیی نهینییەکانی ئیمپراتۆرییەتی بەریتانیی و ستراتیژییەتە سەربازییەکەی بوو، لەگەڵ کچیکی سۆزانییدا.

ئەز دژی ئەو (تایبەتمەندیتی)یە نیم کە تۆ بۆ پیاوی عەرەبی داوا دەکەیت.. بەلام ئەو تایبەتمەندیتییە رەت دەکەمەوە ئەوکاتەی وەك روخسەتنامەی گەرانی بەشوین نەوتدا لە نیو جووت مەمکی ژندای، لی دیت.. یان وەك ئەو مۆلەتنامەیەی لی دیت کە وەزارەتی ناوخۆ بۆ راوە ئاسکی دەبەخشیت..

ئازیزم؛ پیاوەتیی بریتییە لە جوولەی ئەو سۆزەی کە تیایدا جەستە شیوەی قەسیدە وەردەگریت، نەك ئەو (شمشیر)ەی کە سەری ژنی لە شەوی بووکینییەکەیدا پی دەپەرینین.. یاخود ئەو داگیر کردنەی کە تیایدا بۆ جەختکردن لە خەسلەتی میژوویی، یان نەتەوەییمان، تەرو وشك پیکەوە دەسووتینین.

تۆ باس لە (سلوكی جنسی لەلای عەرەب دەكەیت) و دەلییت خەسلەتی ژنی عەرەبت لەو رۆمان و شیعرە عەرەبییانەدا نەدیوەتەوە كە خویندووتنەوە..

ئەزیش لە بەرامبەر ئەوەدا زۆر بە سانایی پیت دەلیم؛ سلوكی جنسی لەلای عەرەب بە تەنێ سلوكی پیاوەو.. ژن لەو سلوكە دابراوە..[٢٣] یاخود بە یەكجاریی لە تەعبیركردنی عاتیفیی و جنسیی خۆی دابركراوە.. چونكە لەناو پیخەفدا هەر بە تەنێ نیرینەیە حوكم دەكات و.. هەر ئەویش لەمەسەلەكانی خۆشەویستیدا گوتەبیژی رەسمییە.. هەرچی ژنیشە، ئەوە ریژەی (زۆرینەی بیدەنگ) پیكدەهینیت .. خۆ ئەگەر زمانیشی خیانەتی لیكردو، تەعبیری لە عاتیفی یان ئارەزووی خۆی كرد، ئەوا سەگ بەحالی نەبیت و، ئەوسا پێی دەلیین؛ ئەو ژنە قەحبەو.. بەیتەشەو.. سۆزانییە..

ئیتر چۆن دەتەویت گویت لە دەنگی ژن بیت لە كاتیكا پیاوی عەرەب هەمیشە ئەوە بە چاك دەزانیت كە ژن كەروڵاڵو.. گیل و.. نەخویندەوار بیت..

**محی الدین صبحی:**

-دواجار، ئیعترافت بۆ دەكەم كە جنس گیروگرفتی هەموومانە، بە ژن و پیاوەوە.. ئەو ئەخلاقیاتە كۆنەش هەرەسی هینا كە جنسی حەرام و قەدەغە دەكرد، بەڵام كارەسات لەوەدایە،

---

[٢٣] مەبەستی لە كردەی جنسییە– وەرگیر.

ئیمە تاکو ئیستا نەمانتوانیوە هیچ ئالتەرناتیڤیك لە جییاندا بدۆزینەوە.. ئەی پیشنیازی تۆ چییە؟

تاقە کۆستی ئیمە ئەوەیە کە هەر بەتەنێ قەیرانی عاتیفیی جنسی بەهەموو رەهەندە تاکیی- کۆمەلأیەتیی- میژوویییەکانیەوە، تاکە قەیران نییە کە چاوەروانی چارەسەرکردن بیت، بەلکو سەرجەم گیروگرفتەکانی: دیموکراسی، یەکیتی، پیشەسازی، فیرکردن، بە میکانیك کردنی کشتوکالّ، هیجرەتی عەقلەکان، کلتوورو، هاوچەرخیتی.. هەموو ئەمانە کۆمەلێ قەیرانی دواخراون و چاوەرێی چارەسەرکردنن.

بەلأم سەرەرای ئەو قاقرییی و لەکارکەوتنەی دووچاری فکری عەرەبی هاتووە، دانیشتوانی عەرەب لە ژمارە زیادبوون و زاووزیدان، ئەوەتا ویرای شەرەکانی ناوخۆ، کەچی بەسایەی خوداوە، ریژەو تیکرای لەدایك بوون زیاترە لە هیی مردن.. ئایا ئەم دیاردەیە بەلگەو نیشانە نییە بۆ جۆریك لە کەلەکەبوون، ئەگەرچی لە ژمارەی قەیرانەکانیشدا بیت؟

*نزار قەببانی:

-ئەخلاقیاتی کۆن هەرەسی نەهیناوە، نە لای نەخویندەوارەکان و، نە لای رووناکبیرانیش..

تاکو ئیستاش (ابو زید الهلالی) لە هەموو شوینیکی ژیانماندا، لە سەنگەرو بۆسەدایە بۆمان، تەنانەت لە

زانكۆكان و، سەنتەرەكانی توێژینەوەی زانستی و، كۆنفرانسە ئەدەبییەكان و، ئەلقە رووناكبیرییەكانیشدا..

كێشەی خۆشەویستیش، وەك هەموو كێشەكانی ترمان، هەتا ئەو كاتەی كێشەی ئازادی لە كۆمەڵگەی عەرەبدا چارەسەر دەكرێت، ئەویش بێ چارەسەر دەمێنێتەوە..

بۆیە هەتا عەقڵی عەرەبی ئازاد نەبێت و.. رای عەرەبی ئازاد نەبێت و پەیڤینی عەرەبی ئازاد نەبێت، مەحاڵیشە جەستەی عەرەبی ئازاد بێت.. سەركوتكردنی جنسییش، وەك سەركوتكردنی سیاسیو، سەركوتكردنی كۆمەڵایەتیو، سەركوتكردنی ئابووری؛ ئەویش ئەلقەیەكە لە ئەلقەكانی زنجیرەیەكی ئاسنین.

سەبارەت بە زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان و، زاووزێكردنیش.. ئەمە دوو دیاردەیە، بە بۆچوونی من چ مانایەك نابەخشن.. چونكە لە ئوسترالیاش مانگاكان، بەبێ ئەوەی هەست بە پێویستی بەرپاكردنی چ كۆدیتا یان شۆڕشێك بكەن، زاووزێ دەكەن و لە زیادبوونیشدان...

